# دیوانی

# ئەمین ئۆشنوویی

«کۆمەڵە شێعری کوردی»



«لەسەر ئەرک و تێکۆشانی:

ئەحمەد بەلەدی»

● نێوی کتێب: دیوانی کوردی ئەمین ئۆشنوویی
● نێوی شاعیر: محەممەد ئەمین بەلەدی «ئەمین ئۆشنوویی»
● بڵاوکەرەوە: ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
● تیراژ: ۲۰۰۰ بەرگ
● چاپی یەکەم: ساڵی ۱۳۷۷ هەتاوی
● لەسەر ئەرک و تێکۆشانی: ئەحمەد بەلەدی

# دیـوانــی

# ئـەمیـن ئـوشـنـوویــی

«کۆمەڵە شێعری کوردی»

«لەسەر ئەرک و تێکۆشانی : ئەحمەد بەلەدی»

## به نیوی خودا

له کاتێکدا ئەم دیوانە ئامادەی چاپ کرابوو، بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە، رووداوی دڵتەزێنی تەسادوفی ماشین، ٧٦/١١/٣٠ سێ شۆرە سواری گۆرەپانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی لێ ئەستاندین. لەو رووداوەدا، کاک مارف ئاغایی (شاعیر و نووسەر)، کاک جەعفەر قازی (نەقاش و پەیکەرەساز) و کاک سەرتیپ مەنسووری (وەرگێڕ و نووسەر)، گیانی پاکیان لە دەست دا و کەوتنە بەررەحمەتی خودای میری مەزن. کاک مارف ئاغایی لە هەموو قۆناغەکانی ئامادەکردنی ئەم دیوانە و هەروەها دیوانە فارسی‌یەکەدا زەحمەتێکی بەرچاوی کێشا و کاک جەعفەر قازی وێنەی رووبەرگی دیوانە فارسی‌یەکەی کێشا....نێوی پڕ لە شانازی ئەو سێ ئەستێرە پرشنگدارە لە ئاسمانی مێژووی هونەر وئەدەبیاتی کوردی‌دا، هەتا هەتا هەر دەدرەوشێتەوە ،رۆحیان شاد و یادی پیرۆزیان بەردەوام بێ.

● ئەحمەد بەلەدی ●

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله الذی ارسل رسوله بالهدی و دین الحق لیظهره علی الدین کله و لوکـره‌المشـرکون. نـحمده و نشکـره و نسـتهدیه و نسـتغفره و نـعوذبالله مـن شرورانفسنا و سیئات اعمالنا من یهده الله فلا مضل له و من یضلل فلا هادی له. و نشهد ان لااله الا الله وحده لا شریک له‌و هو علی کل شیء قدیر. و نشهد ان سیدنا و مولانا محمداً عبده و رسوله البشیر النذیر. صلوات الله تعالی و سلامه علیه و علی آله و اصحابه و اتباعه الذین الهتد و ابهدیه الی یوم الحشر العسیر. و سلم تسلیما کثیرا. قالی تعالی فی کتابه الحکیم.

( الذین آمنو و لم یلبسو ایمانهم بظلم اولائک لهم الامن و هم مهتدون) و قال ( یا ایها الذین آمنو اتقوالله و کونوا مع الصادقین).

زۆر خوشحاڵم که وا قه‌ڵه‌م به ده‌سته‌وه ده‌گرم یادی ئـینسانێکی واقـیعی، ئینسانێکی خزمه‌تگوزار شادره‌وان شاعیر و هونه‌رمه‌ندی بـه نـاوبانگ و عـارف و سـه‌رشناسی مـیلله‌تی کـورد، خـوالێخۆشبوو (مـیرزا مـحه‌ممه‌د ئـه‌مین بـه‌له‌دی)، مه‌شهوور به (ئه‌مین ئوشنۆیی) ده‌که‌م. ئه‌م زاته له بنه‌ماڵه‌کانی کۆن و به ناوبانگ و ئه‌سیلی شاری شنۆیه. ئه‌گه‌رچی من خۆم ئه‌وانه‌م نـه‌دیتبوو، بـه‌ڵام له بـراده‌رانـی شنۆیی و عوله‌ما و فوزه‌لای ده‌وروو‌به‌ر وه هه‌روه‌ها له زمـانی مـه‌رحوومی بـاوکم (حه‌زره‌تی شێخ عه‌لائه‌دینه لنه‌قشبه‌ندی) بیستوومه که ئه‌و شه‌خسه جگه له عه‌شق و شێعر و شاعیری له ناحیه‌ی دیانه‌ت و ته‌قوا و سه‌خاوه‌ت و مه‌ردانه‌گی ده‌ستێکی باڵای بووه وه ئه‌م زاته مه‌حبووبی‌یه‌تێکی خاسی له نێو شار و لادێ و کورده‌واریدا بووه. هه‌مێشه له‌گه‌ڵ مشایخ و عوله‌ما و سادات و پیاوه گه‌وره‌کانی زه‌مانی خـۆی ژیانی بردۆته سه‌ر. ئه‌شعاری زۆری به زمانی فارسی و کوردی بووه که من زۆر له شێعره‌کانم دیوه وه له وته‌ی ده‌نگ خۆشه‌کان که وا له مه‌جالیس دا ده‌خوێنرێنه‌وه

گوێم لێ بووە کە حەقیقەتەن شێعرەکانی گوڵی مەجالیس و غەزای روح و نەشتەت بەخش و لە قەلبی هەموو ئینسانێک دا ئەسەراتی عەجیبی هەیە. لە قەلبێکی پاک هاتۆتە دەرەوە و لە قەلبیش دا جێگیر بووە و دەبێ، وەکوو بیستوومە بە زمانی عەرەبی و تورکیش شێعری وتووە بەڵام من خۆم نەمدیون. وە هەر وەها مەولوودنامەیەکی رێک و پێکیشی هەیە. لە وەلادەتی حەزرەتی رەسووڵی ئەکرەم(ص) کە وا لەگەڵ هەڵبەستە جوانەکانی مەجالیسە ئایینییەکان دەرازێنێتەوە. بە داخەوە تاکوو ئێستا ئەم شێعرە جوانانە وە ئەم ئاسارە بە نرخە پەرت و بڵاو و تا حەددێک لە بیر چووبوونەوە. بەڵام ئەخیرەن خەلفی ساڵەحیان نەوەی بەرێزیان کاک میرزا ئەحمەد کە کورێکی زۆر باش و فەهمیدەیە وەخۆی بە کاری هونەری نەققاشی مەشغووڵە ئەوا پیاوانە شێعرەکانی باپیری بەرێزی کە موودەتێکە لە کوشش دایە کۆی کردۆنەتەوە و ئەرکی لە چاپدانی گرتۆتە ئەستۆی خۆی وە ئەوا بە لوتفی خوای گەورە توانیویەتی دیوانی شێعرەکانی فارسی لە چاپ بدا وە ئەم رۆژانە لە چاپ دەردەچێ. وە دیوانی زمانی کوردیش کە شێعرەکان کۆ کراونەتەوە وە ئینشائەڵڵا ئەویش دەدرێتە چاپ وە ئەم گەنجینە بە نرخانە دەکەونە دەست خەڵق و ئیستفادە و کەڵکی لێ وەردەگرن. دیارە برای بچووکیان کاک عەبدوڵڵا ئەویش کورێکی باش و فەهمیدەیە وە لە دانیشگا ئیدامەی ئەحسیل دەدا، ئەویش لەم بابەتەوە لەگەڵ برای خۆشەویستی هەمکاری و زەحەماتی لازمیان دیوە خودا بە کەرەمی خۆی هەر دووکیان مووەفەق و مووئەییەد بکا. وە لە هەر دوو دونیا بەهرەوەر و سەر بڵیند بن. وە روحی پڕ فتووحی مامۆستای بەرێز (ئەمین ئوشنۆیی) بە جنات النعیم شاد و لەگەڵ سوڵەحا و شوهەدا و سەددیقین مەحشوور و مەلووف بین. وصلی الله علی خیرالوری محمد المصطفی و آله و اصحابه البرده التقی.

الحقیر خادم الفقراء

سەیید تەها کەماڵی زادە. ئەلنەقشبەندی

۷۶/۸/۲۵

## بە ناوی خودا

چاپی ئەم دیوانە پێشکەش دەکەم بە رۆحی پاکی ڕێڕەوانی ڕێگەی تەریقەت:

حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و بنەماڵەی حەزرەتی سەید تەها شەمزینی، حەزرەتی سەید حوسێن سەرڕووتی «خەلیفە سەرڕووت»، حەزرەتی شێخ سەید کەماڵ، حەزرەتی شێخ ئیسماعیل بەرزەنجی، حەزرەتی شێخ بابا سەعید(غەوس‌ئابادی) ، حاجی لازم قاسمی‌راد «حاجی ئەنبی» و هەروەها ئاسانەی:
حەزرەتی شێخ جەمشید کەرەمی، حەزرەتی حاجی شێخ سەید تەها کەماڵی‌زادە، حەزرەتی شێخ سەید فاررووق گەیلانی زادە، حەزرەتی شێخ سەید رەسووڵ سەرڕووتی، حەزرەتی شێخ نەجمەدین بەرزەنجی ، باوکی زۆر خۆشەویستم حاجی محەممەد بەلەدی «کوڕی ئەمین» و هەموو خەڵکی دڵگەرمی زێدەکەم، شاری شنۆ.

# سەرەتا

یەکێک لە کارە گرینگەکانی ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد ( ئینتشاراتی سەلاحەدین ئەییووبی ) هەر لە سەرەتاوە بڵاو کردنەوەی ئاسەواری شاعیران و زانایانی کورد بووە و لە نێو ئەم شاعیرانەش دا بڵاو کردنەوەی دیوانی شێعرەکانی ئەمین ئۆشنۆیی ( فارسی و کوردی ) ئەرکێکی زۆر پێویست بوو کە بەختەوەرانە بە تێکۆشان و هیممەتی کاک ئەحمەدی بەلەدی (نەوەی ئەمین ئۆشنۆیی) بە ئەنجام گەیشت و کەلەبەرێک لە کتێبخانەی کوردی بەم هەڵسووڕانە پڕ کرایەوە.

میرزا محەممەد ئەمین بەلەدی ( ١٣٣٣-١٢٦٨ ) هەتاوی ، بە نازناوی «ئەمین ئۆشنۆیی» شێعری گوتووە و لە سەر ئەوەش را کە شاعیرێکی هەڵکەوتە و پایەبەرزە زۆر کەم ناسراوە و تەنیا گیوی موکریانی لە «کەشکۆڵ»ەکەی خۆیدا بە چەند دێڕیک باسی کردووە. دیوانی شێعرە فارسییەکانی «ئەمین» لە پاییزی ١٣٧٦ی هەتاوی ( ١٩٩٨ زایینی) دا رووی چاپیان بە خۆوە دیت و کەوتە دەست خوێنەرانی تامەزرۆی ئاسەواری شێعر و ئەدەبی کوردی. لە خوێندنەوەی شێعرە فارسییەکاندا بۆ هەموو خاوەن چێژێک دەرکەوت کە ئەمین شاعیرێکی گەورە و عاریفێکی سەوداسەری دڵسووتاوە و بە سەر شێعر و ئەدەبدا زاڵە، هەر ئەوەش وای لە خوێنەران کرد کە داوا بکەن دیوانی شێعرە کوردییەکانیشی بە زووترین کات بڵاو بکرێتەوە و باغی شێعر و ئەدەبی کوردی پێ برازێتەوە. لە سەر ئەو

داخوازی‌یه گشتی‌یه بوو که کاک ئەحمەدی بەلەدی کەوتە هەڵسووڕانێکی چالاکانە و ئەوەندی دەتوانای دابوو شێعرەکانی «ئەمین» ی لێر و لەوێ کۆ کردەوە و ناوەڕۆکی ئەو دیوانەی پێک هێنا. هەر چەند ئەو تێکۆشانە زۆر جێگەی ڕێزە و منەت دادەنێتە سەر هەموو ڕێبوارانی ڕێگەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە هێشتا زۆر شێعری دیکەی ئەمین ئوشنوویی ماون کە کۆ نەکراونەتەوە و دەبێ هەوڵی رزگار کردنیان لە فەوتان بۆ بدرێ. تا ئێستا کە تەنیا چەند مانگێک لە بڵاو بوونەوەی دیوانی شێعرە فارسی‌یەکان تێپەڕیوە، زۆر شێعری فارسی بڵاونەکراوەی ئەو خوالێخۆشبووە لە لایەن دۆستانی فەرهەنگدۆستەوە بە دەست کاک ئەحمەد گەیشتووە. شک لەوە دانیە کە سەرجەمی شێعرە کوردی‌یەکانیش زۆر لەوە زۆرترە کە لەم دیوانەدایە و هیوادارین خۆشەویستان لە هەر شوێنێک دەژین بە چاوپێکەوتنی ئەم دیوانە شێعرە، هەر شێعرێکی بڵاونەکراوەی ئەمین‌یان بە لاوەیە بۆ ئەم ناوەندەی بنێرن تا خوا یار بێ لە چاپەکانی دواییدا رەگەڵ بخرێن و تێدا نەچن.

ناوەڕۆکی شێعرە کوردی‌یەکانی ئەمین لە سەریەک، هەر لە سەر ئەو مەبەستانە دەدوێ کە لە شێعرە فارسی‌یەکاندا دیتوومانە. یانی ئەگەر زنجیرە ناوەڕۆکی شێعرەکانی بخەینە سەر هێلێکی ڕێک و پێک دەبینین کە ئەمین لە سەر هێڵی خواناسی، ئایین، عیرفان، ئەویننداری و پێوەندی کۆمەڵایەتی، شێعری هۆندۆتەوە و لەو ڕێبازە لای نەداوە.

وەک دەڵێین لە پێشدا، ئەمین زۆرتر شێعری جەفەنگی و هەجوی هۆندۆتەوە و زۆرتر بۆ گاڵتە و گەپ لەم کەرەسەیە کەلکی وەرگرتووە. تا رۆژێک کە دەگەڵ پۆلێک لە هاوڕێیان بۆ زیارەتی حەزرەتی « شێخ عەبدولقادر - غەوسی سانی » بەرەو راژان لە مەرگەوەڕ دەکەوێتە رێ. لە درێژایی ئەم ڕێگەیەش دا هەر بە گاڵتە و گەپ دەگەڵ هاوڕێیان دەدوێ و بە تایبەت دەگەڵ یەکێک لە هاوسەفەرەکانی بە ناوی سۆفی سەعیدی شافیعی کە خزمی نزیکی خۆی بووە، بە

شێعر و قسەی نەستەق فڕهاوێژی دەکا. بەڵام دەگەڵ دەگاتە خاکی مەرگەوەڕ، وەک هاوڕێکانی گێڕاویانەتەوە، حاڵی دەگۆڕێ و تێکدەچێ و دەکەوێتە خەلسە و جەزبە و ئەو جار تا دەگاتە ماڵی شێخ بە شێعر بە پێغەمبەر «د.خ» هەڵدەڵێ و ئاگای لە دەور و بەر دەبڕێ. پاش زیارەتی شێخ و گەڕانەوە بۆ شنۆ، هەموو شێعر و قسەی ئەمین دەبێتە حەکایەتی مریدایەتی و عیرفان و خوداناسی و زۆر شێعری بە سۆز و جوان لە مەڕ شێخەکانی ئەو مەڵبەندە دەهۆنێتەوە.

لە زەمانی ئەمین ئوشنوویی و پێش ئەویشدا، شاعیرانی کورد بە زاراوە و بن زاراوەی مەڵبەندی ژیانی خۆیان شێعریان دەهۆندەوە و بێ پەروا واژە و دەستەواژەی فارسی و عەرەبی ( بە تایبەت ئایاتی قورئانی) یان دەخستە نێو شێعرەکانیان. ئەو شێوە کارە لە نالی را بگرە تا دەگاتە مەحوی و سالم و حەریق و وەفایی و میسباح و ئەمین ئوشنوویی و شاعیرەکانی باشوور وەک مەولەوی و خانا و بێسارانی و.... کارێکی ئاسایی بووە و وەک ئەمرۆ شاعیر دەغدەغەی زبانی یەکگرتووی لە زەینی دا نەبووە.

بۆ نموونە لەم روانگەوە هێندێک دەڕوانینە سەر شێعرەکانی ئەمین. لە شێعرە عیرفانییەکانیدا، یا لەو شێعرانەدا کە پەسنی خودا و پێغەمبەر دەدا، گەلێک ئایاتی قورئانی بە کورتی دەکار دەکا و لە واژە و تەرکیب و تەعبیری عەرەبی و فارسی کەلک وەردەگرێ. لە موناجاتێک دا لە بەر خوا دەپاڕێتەوە:

تۆ بە حەققی حورمەتی ئەو سەروەری دنیا و دین

«صادق الوعدەالامین» و رحمة للعالمین

........

تو «شفیع المذنب»ینی رۆژی میزان و حیساب

«رحمةللعالمین»ی ساحیبی وەحی و کیتاب

لە مەدحی رەسووڵی ئەکرەمدا دەفەرموێ:

ئـەی تـایری ئـەوجی فـەلەکـی عـەرشی مـوعەللا

شـــاهەنشەهی ئـــیقلیمی عـــرووجی فـــەتەجەللا

( ای طـــــایر اوج فـــــلک عـــرش مـــعلّی

شــــــاهنشه اقــــليم عـــــروج فـــتجلاّ )

........

ئـــەی تـاقە گـوڵی رەحـمەتی شـاهەنشەهی مـەعبوود

دەر هــەر دوو جـیهانم، بـە خـودا هـەر تـۆیی مـەقسوود

وەک دەبینین دێڕی دووهەمی ئەم شێعرە بە تەواوی فارسی‌یە و لە زۆر شوێنی دیکەش لە واژە و دەستە واژەی وەک ( درپی ، پراز، چو، خوناب، دیگر ، آغوش و خواب و....) کەلک وەردەگری، وەک:

شـەو هـەتا رۆژی تـۆ زاڵـم هـەر لە (خـوابی) غـەفلەتی

رۆژی تـا شـەو (در پـی) لەززاتـی نـەفس و شـەهوەتی

*

ســـینەم وەکـــوو تـەندووری، (پـراز) شـوعلەیی نـارە

جـەرگم وەکـوو نـەی کـون کـونی سەد (زخـم) و فـیگارە

زاراوەی مەڵبەندی شنۆ بە پێی هەڵکەوتی جوغرافیایی نـاوچەی شـنۆ کـە دەکەوێتە نێوان بادینان و سۆران و ئازەربایجان، گەلێک تایبەتمەندی خۆی هەیە و باری جوغرافیایی و پێوەندی دەگەڵ شیمال و کوردی ناوەڕاست و زبـانی تـورکی بۆتە هۆی سەرهەڵدانی زاراوەیەکی شیرین و جوان کە جێگا جێگا لە شێعرەکـانی ئەمین دا دەبێتە، گوڵواژە و گوڵە بەرۆکی هۆنراوە و شێعرەکانی:

گـــەرچـی غـوربەت بـۆ عـەزیزانـی وەتـەن دەرد و غـەمە

مـن کــە حـوبـی تـۆم «هــەبیتن» نامەوێ ئـەهلی وڵات

* * *

گەر دڵت شاد کا دە ئەووەڵ، ئاخریش دەتکا زەبوون

تێ بفکرە ئەو جیهانە، بۆ کەسێ قەت «چوویتە» سەر

* * *

هەر وەکوو گوێت لێ دەبێ ئەورۆ فلانکەس «مردیە»

تۆکەوا ئاخر دەزانی، شادمانیت بۆ چیە؟

له زاراوەی شنۆیی دا له جیات ( مان ) له حاڵەتی ( مالکیت ) ی کۆ دا تەنیا له (ن) کەلک وەردەگرن وەک ماڵن له جیات ماڵمان، وڵاتن له جیات وڵاتمان، له شێعری ئەمین ئوشنوییش دا، ئەم حاڵەته زۆر بەرچاوه.

وەعدەیی وەسڵت بە من دا کارێکی بێجا نەبوو

بۆ وەپاشت خست عەزیزم خۆ (قەرارن) وانەبوو

* * *

ئەی بادی سەبا ئیمڕۆ قاسید بە دەفەرمانم

بۆ خزمەتی سۆفی ( خۆن) ئەو نووری دوو چاوانم

* * *

یارەببی شەوی ماوه یا کازیوەی کێشاوه

(چان) دێمی نەکێشاوه، دەنگێک دێ له گوێیانم

له زۆر جێگەش دا له جیات ( له ) کەلکی له ( دە ) وەرگرتووە کە ئەوەش دەبێتە هۆی دڵخۆشی لایەنگرانی (دە) له شەڕی بێ بڕانەوەی ناو خۆی (دە) و (له) دا!

گەر دڵت شادکا ( دە ) ئەووەڵ، ئاخریش دەتکا زەبوون

* * *

ئەورۆکە ( دە ) بەحری غەمی دڵ بووم ( دە ) شەنادا

حوسنی روخی یارم بە نەزەر کەوت له پەنادا

دیسان له زاراوەی شنۆیی دا له جیات (ێک) له (ەک) کەلک وەردەگرن و له

دیوانی ئەمین دا لە زۆر جێگادا ئەوە دەبینن وەک:

سـیککەیی قـەڵب و ڕەواجـم (جـارەکـی)سـەرراف بکـە

بـاقری جـامی وجـوودم وەک بـلووری سـاف بکـە

* * *

( فکـرەکـی ) نـاکـەی لە حـاڵی خـوفتەگـانی نـێو قـبوور

مـەنزڵی وا پـڕ لە خـۆف و مـەسکەنی وا تـەنگ و قـوور

بێجگە لە شێعر و هۆنراوەی فارسی و کوردی و مەولوودنامە، بـەیتێکیش (بەیتی عبدالرحمن) لە ئەمین بە جێ ماوە کە ناوەڕۆکی مەزهەبی هەیە وهێشتا لە چاپ نەدراە و بڵاو نەکراوەتەوە. هیوادارم چاومان بەم ئاسەوارەش روون بێتەوە و باقی شێعرەکانی ئەو شاعیرە ئەویندار و پایەبەرزە بە تەواوی لە ژێر هەوری رەشی نەناسیاوی وەدەرکەوێ.

قازی – ئەحمەد

ورمی ۷۶/۱۱/۱۱

## به ناوی خودای دلۆڤان

دوای ئەوەی دیوانی شێعرە فارسی یە کانی «ئەمین» لە چاپ هاتە دەر، خەلک، بە تایبەت ئەو کەسانەی «ئەمین»یان دەناسی و ئاشنای شێعرە کانی بوون، بە رادەیەک خۆشحاڵ بوون کە خۆم باوەڕم نەدەکرد. ئەو هۆگری یەی خەلک لە لایەک و ئەویندارانی مریدانەی خۆم لە لایەکی ترەوە هانیان دام هەتا پتر هەست بە بەرپرسایەتی بکەم. هەر وەک لە پێشەکی دیوانە فارسی یەکە دا مامۆستا ئەحمەدی قازی ئاماژەی کردووە، سەرجەمی شێعرە فارسی و کوردی یەکانی «ئەمین» لە سی و چەند ساڵ بەر لە ئێستاوە لە لایەن بلاّوکەرەوەی سەیدیان لە مەهاباد، دەستی بە سەرداگیراوە کە نە هەوڵێکی بۆ بلاّوکردنەوەیان داوە و نە داویەتەوە بنەماڵەکەی! ئەم شوێنەوارە دەهات لە نێو بچێ، هەتا ئەوەی کە بەیازێک لە دیوانە فارسی یەکەی کە بە خەتی خودی «ئەمین» نووسرابۆوە و خوالیخۆشبوو حاجی شێخ محەممەد شنۆیی مەحموودزادە، بەو پەڕی ئەمانەتداری یەوە پارێزگاری لێ کردبوو، لە لایەن خۆیەوە بە دەستمان گەیشتەوە و بلاّومان کردەوە. لە کاتی کۆکردنەوەی شێعرە کوردی یەکانیش داگەلێک شێعری فارسی ترمان چنگ کەوتەوە. بەلاّم مخابن دیوانە فارسی یەکە، کەوتبووە ژێر چاپ و تازە کارێکمان بۆ نەدەکرا. هەر بۆیە بڕیارمان دا کە ئەم شێعرە فارسی یانە بکەینە پاشکۆی ئەم کتێبە و لە فەوتان رزگاریان بکەین.

ئێمە بۆ کۆ وەکردنی شێعرە کوردی و فارسی یەکانی ئەمین، سەرمان بە

زۆر جێگادا کێشا، دەرگای گەلێک ماڵمان تەقاند، هەر شوێنێک شکمان لێی بوو سەرمان لێ دا. لەم ڕێگا پڕ هەوراز و نشێوەش دا، گەلێک لە دڵسۆزان هانیان داوین و بە هانامانەوە هاتوون. دیارە شێعرە کوردی یەکانی «ئەمین» زۆر لەوە زیاترن. هەر بۆیە دەستی تکا بۆ ئێوەی بەڕێز درێژ دەکەین کە ئەگەر بەیاز، نامیلکە یا تەنانەت شێعرێکتان لە لا هەیە، بۆمانی بنێرن هەتا ئەگەر خودا یاربێ لە داهاتوودا سەرجەمێک لە شێعرە کوردی و فارسی یەکانی بە یەکەوە بڵاو بکەینەوە.

ئەگەرچی ژیان و بەسەرهاتی «ئەمین» لە سەرەتای دیوانە فارسی یەکەیدا هاتووە. بەڵام چونکوو چینی خوێنەرانی ئەم دوو دیوانە تا رادەیەک تۆفیریان هەیە، بە پێویستمان زانی لە سەرەتای ئەم دیوانەش دا کورتەیەک لە ژیانی «ئەمین» بنووسینەوە.

میرزا محەممەد ئەمین بەلەدی، ناسیاو بە «ئەمین شنۆیی» لە ساڵی ١٢٦٨ی هەتاویدا، لە داوێنی سروشتی دڵرفێن و سەر سەوزی شارە رازاوەکەی شنۆ، لە بنەماڵەیەکی بە ناوبانگ و دەڵاوادا لە دایک بووە. «ئەمین» تەنیا منداڵی بنەماڵەکەی بووە. حاجی برایم «باوکی ئەمین» مرۆڤێکی ناوبەدەر و بە دەسەڵات بووە و بۆ بارهێنانی «ئەمین» لە هیچ هەوڵ و تێکۆشانێک خۆی نەبواردووە. لەو سەردەمدا کە لە شاری شنۆ نە قوتابخانەیەک بووە و نە مامۆستایەک، حاجی برایم بۆ راهێنانی «ئەمین» لە باشترین راهێنەران و دەرس بێژانی ئەو کاتی کەلک وەرگرتووە. حاجی برایم کە مرۆڤێکی زۆر خوداناس و بە ئیمان بووە، لە ساڵانی قاتی و قڕیدا هەموو ماڵ و داهاتی خۆی تەرخانی کڕینی گەنم و دابەش کردن بە سەر فەقیر و هەژاراندا کردووە و بەم ئاکارە خودا پەسندانەیە سەدان کەسی لە مردن رزگار کردووە. بە داخەوە «ئەمین» هێشتا نەگەیشتبووە تەمەنی یازدە ساڵە، کە حاجی برایمی باوکی بە شێوەیەکی زۆر ناپیاوانە بە دەس دوژمنەکانی دەکوژرێ. ئەگەرچی حاجی قادر «مامی ئەمین» کە ئەویش لە گەورە پیاوانی

سەردەمی خۆی بووە، «ئەمین» دەگرێتە ژێر باڵی خۆیەوە، بەلاّم زۆری پێ ناچێ ئەویش لە ڕێگای بەرگری لە دین و وڵات، لە شەڕ دەگەڵ ڕووسەکان لە دەروبەری ڕەواندزی عێراق دەکوژرێ و «ئەمین» ئەیزەن بێکەس دەمێنێتەوە.

... ئەمین» موڵک و ماڵێکی زۆری بە میرات پێگەیشتبوو، بەلاّم ماڵی دونیایە هەرگیز نەیتوانی ڕێی لێ هەتڵە بّدا، چونکە «ئەمین» هەست و سۆزێکی تری لە دڵدا بوو. ئەویندارێکی ڕاستەقینە و پاک و بێ گەرد بوو. هەر ئەو ئەوینە پاکە بووکەگری لە دەروونی بەردا و بەرەو دنیای شێعر و عیرفانی کێشا. «ئەمین» هەست و سۆزی شاعیرانەی خۆی بە ئیلهام وەرگرتن لە سۆزی ئەوین و جوانی سروشت لە لایەک و خۆناسین و خوداناسین لە لایەکی ترەوەگەیاندە ئەو پەڕی خۆی. ئەوەی «ئەمین» لە دڵەوە دەیهۆندەوە، زۆر بە زوویی دەکەوتە سەر دلاّن. شێعرەکانی بە هۆی پاراوی و دڵگر بوونیانەوە، زۆر زوو جێگای خۆیان دەنێو کۆڕی جەزبەی سۆفیان و زیکری دەروێشان دا دەکردەوە و هەنووکەش دەکۆڕە شێعرییەکاندا جێگەی بەرزیان هەیە.

«ئەمین» دەگەڵ هۆنەرانی سەردەمی خۆی، وەک: جەنابی قازی محەممەدی خزری، سافی، میرزا مراد و.... هتد، پێوەندی شێعری بووە و شێعرەکانی خۆی دەمایەگەلی تەنز و پەند و پێ هەڵکوتن و... بە زمانی کوردی، فارسی و عەرەبی هۆنیوەتەوە.

خەڵک «ئەمین» وەک شاعیرێکی بەهەست، تۆڕەوانێکی زانا، حەکیمێکی **دلۆڤان**، دڵسۆز و شارەزا دەناسن. «ئەمین» دەگەڵ هێندێ لە عارفان و شێخان و ناودارانی ئایینی سەردەمی خۆی، وەک: عارفی ناودار، حەزرەتی سەید حوسێن سەرڕووتی (خەلیفە سەرڕووت)، حاجی شێخ ئیسماعیل بەرزەنجی، حەزرەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی (غەوسی سانی)، شێخ عەبدوڵلاّ ئەفەندی (گەیلانی زادە) و حەزرەتی شێخ عەلاوەدین کەماڵیزادە، هاودەم و هاومەجلیس بووە و دەگەڵ زۆربەی گەورە پیاوانی ئەهلی تەسەووف و تەریقەت

لە پێوەندی دابووە.

جگە لە خەلیفە سەرڕووت بۆ هەمووی ئەوانە شێعری هۆنیوەتەوە. (وەک ئەمن بزانم خەلیفە سەرڕووت خۆی ئیزنی نەداوە کە «ئەمین» بە شێعر پێی هەڵبڵێ). «ئەمین» بە هۆی وریایی و لێهاتوویی خۆیەوە. جگە لە زمانی کوردی و فارسی، تورکی و عەرەبیشی زۆر چاک زانیوە.

ناسیاوی دەگەڵ ئەم زمانانە، «ئەمین»ی لە وەرگێڕانی کتێبگەلی شیاو و بەکەلک، بە تایبەتی کتێبی پزیشکی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان یارمەتی دەدا.

«ئەمین» گیا دەرمانییەکانی بە باشی ناسیوە و لە تیبی گیایی دا حەکیمێکی کەم وێنە بووە و نەخۆشەکانی بێ هیچ چاوەڕوانییەک دەرمان کردووە. هەنووکەش نوسخەیەکی ئەستوور لە دەستنووسی «ئەمین» لە پێوەندی دەگەڵ گیاگەلی دەرمانی لە لای بنەماڵەکەی پارێزراوە. بەڵام بەداخەوە لە هیچ شوێنێکی کتێبەکە دیاری نەداوە کە لە شوێنەوارەکانی خۆیەتی یا لە زمانگەلی تر وەری گێڕاوە.

دڵاوایی «ئەمین» کەوتبووە سەر زاران. بە پێی وتەی خزم و کەسەکانی، هەر کات بەلەنگازێک دەچۆ بەر دەرکەی، لە بەشە چێشتی خۆی پارووی دەزاری دەنا. بە شایەدی ئەو کەسانەی ئەویان دەناسی، لەو هەموو بەشە ماڵەی کە پێی برابوو و ڕەنگە بەشی سێ بەشی شنۆیەی کردبا، بەشی هەرە زۆری بە هەژاران و بەلەنگازان دەبەخشی و هەر وەک لە هێندێ لە شێعرەکانیدا ئاماژەی پێ کردووە. لە دوایین ڕۆژەکانی ژیانیدا تەنانەت تووشی دەست کورتیش ببوو. «ئەمین» ڕزگاری کۆمەڵی دە بەڕێوە بردنی خوو و خدەی ڕەند و باش دا بەدی دەکرد. لە ڕۆحی گەورەپیاوێکی وەک «ئەمین» هەر ئەوە چاوەنوار دەکرا.

«ئەمین» بە هۆی گەورەیی و ڕێز و حورمەتێکی کە لە لای خەڵک بوویەتی، بە شارەداری شنۆ هەڵدەبژێردرێ و ناوبانگی بنەماڵەی «بەلەدی»ش

هەر لە بەلەدییە واتە شارەداری وەرگیراوە. دوای ئەوە بەرپرسایەتی وەک: بەرپرسی دایرەی پەروەردە و فێرکردن و دایرەی سەبت و ئەحوالی پێ دەسپێردری و لە ئاکامدا روو دەکاتە ئیشی ماموٚستایی و دەرس گوتنەوە.

ئەمین دە دەرس گوتن و زانست و ئەحکامی خودایی دا ماموٚستایەکی بێ وێنە بووە و بلیمەتی خوٚی لەم بەستێنەش دا دەرخستووە.

«ئەمین» سێ ژنی هێناوە. لە ژنی یەکەمی کە هەر لە تەمەنی لاویدا کوٚچی کردووە، دوو کوری بە ناوی رەحمان و محەممەد بووە کە محەممەدیان لە ژیاندایە و کچێکیشی بە ناوی نازدار بووە کە بە جوانەمەرگی سەری ناوەتەوە. «ئەمین» بوٚ جاری دووهەم زەماوەند دەکاتەوە. بەلاّم ئەمجارەیان لە زەماوەندەکەیدا زوٚر سەرکەوتوو نابێ و رەنگە تالّترین سەردەمی ژیانی ئەو، هەر ئەو کاتە بووبێ کە دەگەلّ ژنی دووهەمی ژیاوە. خوو و خدەی خەراپی ئەو ژنە دەگەلّ روٚحی ناسک و هزر و بیری شاعیر نەیدەخوێندەوە. هەر وەک لە شێعرەکانیدا درکاندوویە، خوٚی لە چنگی رزگار دەکا. بەرهەمی زەماوەندی دووهەمیش کیژێک بووە بە ناوی «نوورجەهان« کە چوار پێنج سالّ لەمەو بەر کوٚچی کرد. ژنی سێهەمی ئامین، ئاموٚزای خوٚی بوو کە تا کوٚتایی ژیان دەگەلّی بوو.

« ئەمین» جگە لە دیوانی شێعری فارسی و کوردی، بە بوٚنەی لە دایک بوونی حەزرەتی رەسوولّ «د.خ» شێعرگەلێکی بە ناوی «مەولوودنامە» هەر لە خولّقانی نووری پاکی حەزرەت هەتا دەمی لە دایک بوونی‌یەوە هوٚنیوەتەوە. ئەم مەولوودنامەیە، ئێستاش هەموو سالێک لە مانگی مەولوودی پێغەمبەری مەزن دا لە گشت کوٚر و کوٚبوونەوەیەکی کە بەم بوٚنەوە «بە تایبەت لە ناوچەکانی شنوٚ و ورمێ»دا بەرێوەدەچێ، دەخوێندرێتەوە. «ئەمین» هەتا مابوو لە کوٚری مەولوود خوێنی لە مانگی مبارەکی مەولوود دا، سەرهەلّقە و مەزنی کوٚرەکە بوو. ئەو شێعرانەی کە لەو کوٚرانەدا دەخوێندرانەوە، لە هوٚنراوەکانی «ئەمین» بوون کە

خۆی ئاهەنگی بۆ دروست کردبوون و ئێستاش هەر وا لە سەر هەوا و ئاهەنگی خۆیان ماون. لە سەر داوای پەیتا پەیتای هۆگرانی «ئەمین» سەرجەمی مەولوودنامەکە لە دوا لاپەڕەکانی ئەو دیوانەدا دەخەینە بەرچاوی خوێنەران.

«ئەمین» یەکێک لە بناخەدانەرانی کۆڕی پەروەردە و فێرکردنی نوێ لە شاری شنۆ بووە. بە هۆی ئەو خزمەتانەیەوە، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراندا، یەکێک لە قوتابخانەکانی شاری شنۆی بەناوکراوە.

«ئەمین» خۆشەویستی خەڵک بوو و لە دڵی گشت چین و توێژێک دا جێی خۆی کردبۆوە. تا ئەو رۆژەی ژیا هیچ کات هەستی بە ماندوویی و داکەوتوویی نەکرد ولە ئاکامدا،ساڵی ١٣٣٣ی هەتاوی، بە هۆی نەخۆشی، دەفتەری ژیانی بەسترا و دنیای فانی بە جێ هێشت.

بە مردنی «ئەمین» خەم و ماتەم باڵی بە سەر شاری شنۆدا کێشا. بەم بۆنەوە گشت دایرەکانی دەوڵەتی لە شنۆ داخران و خەڵکی شار لە رێ و رەسمی بە خاک سپاردنی دا بەشداریان کرد. دایکم کە بووکی ئەمین بوو دەڵێ:

«ئەمین» لە جێگەدا نەخۆش کەوتبوو، شەوێک بەر لە مردنی لە خەودا دیتم پێغەمبەری مەزن «د.خ» لە ماڵی ئێمە وەژوور کەوت، لە «ئەمین» نزیک بۆوە، خۆی بە سەر دا کێشا و «ئەمین»ی ماچ کرد. بەرە بەیانی ئەو شەوە «ئەمین» کۆچی دوایی کرد. لەشی پاکی ئەم شاعیرە نەمرە لە گۆڕستانی «خەلیفە مەلاخدر»ی شاری شنۆ بە خاک ئەسپێردراوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە لە لایەن بنەماڵەی ئەمینەوە، سوپاسی بێ پایانی خۆم لە هەموو ئەو بەڕێزانەی کە لە پاراستن و وەدەست هێنان و ئامادەی چاپ کردنی دیوانی «ئەمین» دا یارمەتی یان داوین پێشکەش بکەم و رێز و حورمەتی ئەم بنەماڵەیە دەرببڕم سەبارەت بە دڵسۆزی یەکانی:

بەڕێزان: بابەخان زەرزا، میرزا رەحیم شنۆیی مەحموود زادە، میرزا سوڵتان فەڕوخ زادە، قادر فەڕوخ زادە، بنەماڵەی خوداڵێخۆشبوو حاجی شێخ

محەممەد شنۆیی مەحموودزادە (لەبەر پاراستنی شوێنەوارەکانی ئەمین.)

بەڕێزان: موهەندیس سەید ئیبراهیم گەیلانی زادە، مەلا عەبدوڵڵا دەربەندی، عەبدولکەریم قاسمی راد (حاجی ئەنبی)، ئیبراهیم تەقی سوڵتانی، موتەلیب بەلەدی، عەبدوڵڵای بەلەدی (بە هۆی هاوکاری لە کۆکردنەوەی شوێنەوارەکاندا)

بەڕێزان: ئەحمەدی قازی و مارفی ئاغایی و رەسووڵ وەیسی و گشت ئەندامانی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی، بە هۆی پێدا چوونەوە و تەیارکردنی هەل و مەرجی چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم دیوانە.

ورمێ، زستانی ١٣٧٦ی هەتاوی

ئەحمەد بەلەدی

# گـــازە

ئەی خـوداوەنـدی کـەریم و خـالقی لەیـل و نـەهار
واحیدی گەورە و عەزیم و رازقی هـەر مـوور و مـار
خۆت دەزانـی حـاڵی مـن، ئـەی پـادشاهی کـردگار
عەبدێکی زۆر روو رەشم، زۆر عاسی و زۆر شەرمسار
نیم بە هیچ ئـەشیا بـە غـەیری لوتـفی تـۆ ئـومیدوار

چـــاو دەگــێڕم تـــا ببینم عـالەمێ سـاحێب گـوناه
نابینم هیچ کەس وەکوو خۆم، شەرمەسار و روو سیاه
عومرەکەم یەکسەر لە لەهوو لەعبی دونیا کـرد تـەباه
زۆر پەشیمانم لە زەنب و سـەهوی نـیسان یـا ئـیلاه
خۆم بـە تـۆ ئـەسپارد، نـیمە تـاقەتی سـووتانی نـار

تۆ غەفووری، تۆ سەبووری، تۆ رەئووفی ، تۆ رەحیم
تۆ خەبیری، تـۆ بـەسیری، تـۆ سـەمیعی، تـۆ عـەلیم
من گـونەهکار و زەلیـلم، عـاسی و مـەزنەب ئـەسیم
تۆ شەهی ساحێب کەرەم، من هەم لە دەرگاهت یەتیم
من گەدایی عاجیز و تـۆی شـاهی سـاحێب ئـیقتدار

گەرچی ئـەعدادی گـوناهم نـایەنە حـەد و حـیساب
کاغەزی سەر شانی چـۆپەم، پـڕ لە ئـەفعالی خـراپ
لایەقم بۆ مەغفیرەت، یـا مـووستەحەقم بـۆ عـەزاب
نائومێد نیمە لە روحمت، روحمی تۆ زۆرتر لە بـاب
روحمەکم پێ بکە، لە نەزعی رۆح و قەبری تەنگ و تار

تۆ بە حەققی حورمەتی ئەو سەروەری دونـیا و دیـن
صـــادق الوعـــده الامـــین و رحـــمة للـــعالمین
ساحێبی قـورئان و وەحـی و ئـیفتخاری مـورسەلین
عەفوو کە یەکسەر خودایا، زەنب و عوسیانی ئـەمین
تۆ بـە قـورئانی قـەدیم و حـورمەتی هـەر چـار یـار

# گازە

یا «شفیع المذنبین»، تۆ چارەیی کارم بکە
زۆر پەشیمانم عیلاجی قەلبی بیمارم بکە
مەرهەمێکی لەو دەروونی وا بریندارم بکە
روحمێکی بەو زیللەت و بەو چاوی خوێنبارم بکە
پێم کەرەم کە جامی عیشقێ مەست و خوممارم بکە

عاسی و دەرماندە و زار و زەلیلم دڵ بە خەم
عومرەکەم رابرد لە ئەهوو لەعبی دونیا بیش و کەم
رۆژێکی روونم نەدی غەیری خەم و دەرد و ئەلەم
گەرچی زۆر ساحێب گوناهم،ئۆمەتی تۆم هەرچی هەم
هەر بە خۆت روحمێ بە ئاه و نالەیی زارم بکە

وەختێ عیزرائیل کە دێ بۆ قەسدی قەبزی گیانی من
لەشکری ئیبلیس دێ، بۆ غارەتی ئیمانی من
دێ سەدایی گریە و شیوەن لە فەرزەندانی من
ئەی نیساری خاکی بەر پێت، سەد هەزار وەک گیانی من
زوو بگە هاواری من، لەو وەزعە قوتتارم بکە

دوو مەلایک دێنە سەر من، وەک لە قەبری تەنگ و تار
بـۆ سـوئالێ لێم دەپـرسن وا بـەشیددەت ئـاشکار
من غەریب و عـاجز و تـەنها و بـێ ئـەحباب و یـار
یا رەسوولەڵلا، تۆ بـمکەی لەو عـەزابـەی رەسـتگار
شـادومانی فـەیزی لوتـفی شـاهی غـەففارم بکـە

تـۆ «شـفیع المـذنبین»ی ، رۆژی مـیزان و حـیساب
«رحـمةللعالمین»ی، سـاحێبی وەحـی و کـتاب
من ئـەمینی رووسـیا، گـەر مـوستەحەقم بـۆ عـەزاب
ئـۆمەتی تـۆمە، زەلیـلم ئـەی شـەهی عـالی جـەناب
تـۆ پـەناهی عـاسیانی چـارەیی کـارم بکـە

# یا رەسوولەڵلاَ

ئەمن شەرمەندە و ساحێب گوناهم یا رەسوولەڵلاَ
پەشیمان و زەلیل و روو سیاهم یا رەسوولەڵلاَ
لە دونیا و قیامەت خۆ دەزانی ئوٚمەتی توٚمە
بە جوز توٚ کەس نیە پشت و پەناهم یا رەسوولەڵلاَ
لە بەر شەرمی گوناهی خوٚم دەگریەم و دەناڵێنم
بکە روحمیٚ بە گریان و بە ئاهم یا رەسوولەڵلاَ
هەموو عومری عەزیزم سەرفی لەهوو لەعبی دونیا کرد
بە خوٚڕایی لە دەست چوو ساڵ و ماهم یا رەسوولەڵلاَ
لە دەرگاهی توٚ ئەی شاها دەزانم نائومێد نابم
گەدامە سائیلی دەرگاهی شاهم یا رەسوولەڵلاَ
بە عالەم وا بڕاوە خەرمەنی ئیحسانی لوتفی توٚ
بدە لەو خەرمەنەی یەک پەڕە کاهم یا رەسوولەڵلاَ
لە سەر نامەی ئەمینی دا سەراسەر هەر گوناه سەبتن
کرام‌الکاتبین بوونە گەواهم یا رەسوولەڵلاَ

# وەسفی حەزرەتی محەممەد (د - خ)

شەرمەندەیە گول، ئەز روخی زیبایی محەممەد
سازەندەیە بولبول، لە تەماشایی محەممەد
جوبریلە سەنا خوانی سەراپایی محەممەد
تەسبیحی مەلەک، مەدح و سەناهایی محەممەد
ئەی جان بە فیدای نەرگسی شەهلایی محەممەد

وەک لەیلییە میعراجی، لە سەر جێ خۆ کە رابوو
جوبریل لە مەقامی خۆ لە خزمەت وی جودا بوو
عیسایی نەبی گەرچی لە سەر ئەوجی سەما بوو
ئەو تایرە میعراجی لە سەر عەڕشی خودا بوو
حەق کردی سەلام، ئەز قەد و باڵایی محەممەد

زاهیر بوو لە ئادەم وەکوو نووری شەهی خاتەم
جەمعی مەلەکان سوجدە دەبەن حەزرەتی ئادەم
سەلەواتی خودا بێ لە جەماڵی وی هەموو دەم
وەڵڵاهی بە ئەو واحید و خەللاقی دوو عالەم
دەر عالەم و ئادەم نییە هەمتایی محەممەد

مەحبووبی خودا رەحمەتی حەق سـەییدی سـەروەر
فەخری دوو جیهان شاهی نـەبی شـافیعی مـەحشەر
سوڵتانی جیهان خەتمی رەسووڵ سـاحێبی کـەوسەر
شەمس و قەمەر ئەز مـوقتەبیسی نووری وی یەکسەر
جـــن و بـــەشەرن عـــاشق و شـەیدایـی مـحەممەد

شـــــەرمەندە و شـــــێواو و پــەرێشان و حـــەزینم
لەو شـــاری شـــنۆ بـــێ کــەس و بـــێچارە ئــەمینم
سەد شوکری خودا ئـوممەتی ئـەو سـەروەری دیـنم
مـــاڵ و ســـەر و ئــەولاد و روح و گــیانی شـیرینم
قـــــوربانی قـــەد و قـــامەتی رەعـــنایی مـــحەممەد

# مەدحی حەزرەتی رەسووڵی ئەکرەم (د.خ)

ئـەی تـایری ئـەوجی فـەلەکـی عـەرشی مـووعەللا
شـــاهنشەهی ئـــیقلیمی عـــرووجی فـەتەجەللا
ســـوڵتانی مـــەقامات و کـــەڕامـــاتی تـــەجەللا
بـــاعیس بــە تــۆ بـوو خـەڵق کـران ئـادەم و حـەوا
عـەرش و فـەلەک و ئـەرز و سـەما جـەننەتی ئـەعلا

نووری تۆ لە رووی ئادەمێ بـوو حـازر و مـەوجوود
بـــۆ جـــەمعی مـەلاییک خـودا کـردی‌یە مـەسجوود
ئـەی تـاقە گـوڵی رەحـمەتی شـاهنشەهی مـەعبوود
دەر هەر دوو جیهانم بە خودا هـەر تـۆیی مـەقسوود
غـــەیرەز تـــۆ کـــەسم نــیە لە دونـــیا و لە عـــوقبا

حـــامیم و مـــووزەمیل بـــووە ئـــەکـــلیلی قـەبایەت
شـــەرحـــی تــۆ (الم نشـرح)ە جـانم بـە فـیدایـەت
ئەی (خلقی عظیم) مەدحی تـۆ (لولاک) سـەنایەت
(یـــعتیک فـــترلا) بـــووە ئـــەنعام و عـــەتایەت
بـــۆ قـــامەتی رەعـــنایی تـــۆ بـــوو خـــەلعەتی زیبا

ئــیعجازی تــۆ( شــق‌القــمر)ە ســەییدی عــالەم
کــوففاری قــوڕەیشی هــەموویان کــەوتوونە مــاتەم
سەد مووعجیزەیی دی لە تۆ زاهــیر بــوو بــە هــەردەم
هــاتوون بــە زوبــان شــادە دەدەن وەک بــەنی ئــادەم
بــۆ دەعــوەیی پــێغەمبەریت ئــان ئــاهوویی ســەحرا

عــــاسیی و گــــوناهکارە ئــەمین ئــەهلی شــنۆیە
بــــێزار لە ئــــەقوام و لە مــــاڵ و ســەری خــۆیە
شــــەرمەندە و ئــەفکەندە وەکــوو کــۆنە پــەڕۆیە
ئــومێدی بــە لوتــفی حــەقە چــون ئــوممەتی تــۆیە
ســـائیل نــیە مــەحرووم لە دەرگــاهی شــەهنشاه

# وەفاتنامەی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام (د.خ)

وەختی قەبزی رووحی پاکی حەزرەتی خەیرولئەنام
فەسڵی عیزرائیل لە پێشی رادەوەستا وەک غولاٚم
یا محەممەد بەر جەماڵت سەد دروود و سەد سەلام
هاتوومە بتکەم زیارەت عومری پاکت بوو تەمام
گەر ئیجازەی تۆی لە سەر بێ تا بە جێی بێنم مەرام

حەزرەتی فەرمووی لە کوێیە ئەورۆ جوبرائیل ئەخی
رابوەستە تاکوو دێتن کارەکم پێیە بە وی
هاتە خوارێ جوبرەئیل بۆ خزمەتی شاهی نەبی
یا رەسوولەڵلاٚ لە خزمەت خووای لە بۆ تۆ مووژدەبی
بۆ وجوودت ئینتزارن جەننەت و حۆری تەمام

حەزرەتی فەرمووی برادەر مەقسەدی من ئۆمەتە
چونکە دەردی رۆح کێشانێ دەردێکی زۆر زەحمەتە
ئۆمەتی زار و زەلیلم ناگرێ کەس تاقەتە
جوبرەئیل فەرمووی خودا پێیان دەکاتن رەحمەتە
ئۆمەتی تۆیە رەئیسی کوللی ئۆمەت خاس و عام

تۆ« شفیع‌المذنبین»ی رۆژی مـەحشەر یـا رەسـووڵ
هەر تکـایەکـی بکـەی خـالق دەکـاتن لێت قـەبووڵ
بـا دڵـی پـاکت نـەبێ بـۆ ئـۆمەتێ هـەرگیز مـەلوول
کەس لە پێشی ئۆمەتی تۆ بۆ بەهەشت ناکـا دخـوول
ئەی مەکانت عەڕشی ئەعزەم قـابە قـەوسینت مـەقام

جـا ئـیجازەیدا بـە عـیزرائـیل ئـەو فـەخری کـوبار
سێوی جەننەت بۆنی هات‌و رەحمەتی‌حەق هاتەخوار
رۆحـی پـاکـی هـەڵکشا گـرتی لە چـۆکـانی قـەرار
بوون لە خزمەت فەخری عالەم ئەو دەمی هەر چاریار
جامێکی ئاو تەڵەب کردو دەستی دانـا نـێو جـام

حـەزرەتی شـاهی ویـلایەت، ئـەو عـەلیی مـوڕتەزا
وای دەفەرموو لێوی پاکی، حەزرەتی بوون بێ سـەدا
چوومە پێشێ گوێم دەدایێ وای دەفەرموو یـا خـودا
ئوممەتی ئۆممەت، هەتاکوو رۆحی پاکی بوو جـودا
ئەلویداع ئەی شاهی عالەم ساحێبی وەحـی و کـەلام

پشتیوانـی رۆژی مـەحشەر، سـەییدی دونـیا و دیـن
(صـــادق‌الوعــدالامــین) و( رحــمته للــعالمین)
بێ کـەس و زار و زەلیـل و زۆر گـوناهکارە «ئـەمین»
غەیری روحمی خالق و تۆ هیچ پـەناهی نـین یـەقین
یـــا (شــفیع‌المــذنب)یـن،( اشـفع لنـا یـوم‌القـیام)

## سلسلەی تەریقەتی قادری کە «ئەمین» بە فەرمانی شێخ ئیسماعیلی بەرزەنجی نووسیویە

ئـــیلاهی هـــەدیە بـــێ ئـــەو خـــێر و ئـــیحسان
لە بـــۆ رۆحـــی رەســـووڵی حـــەیی سـوبحان

حـــەبیبی حـــەق شـــەفیعی رۆژی مـــەحشەر
مـــــحەممەد مســـــتەفا ســـوڵتانی ســـەروەر

لە پـــاشی وی لە بـــۆ بـــووبەکـــری ســـدیق
رەفـــــیقی غـــــار ئـــیمامی راهـــی تـــەحقیق

دووەم بـــۆ رۆحـــی پـــاکـــی زاتـــی عـــومەر
چـــراغـــی مـــەسجد و مـــێحراب و مـــینبەر

ســـەیوم عـــوسمانی ســاحێب دیـــن و ئـیمان
ئــــــیمامی جــــــامعی ئــــایاتی قــــورئان

چـــــوارەم قـــەلعەگـــیری جـــەنگی خـــەیبەر
کـــــەبابی عـــــیلمە بـــۆ شـــاری پـــێغەمبەر

لە بـــۆ رۆحـــی ئـــیمامەینەل هـــومای دیـــن
حـــەسەن زاتـــی حـــوسێن دوو قـورڕەتولعەین

لە پـــــاشی وان لە بـــــۆ ئـــەسحابی کـــوبار
عــــومومی تـــــابعین ئـــەخیار و ئـــەبرار

خســــووسەن بـــۆ خـــەلیفەی زاتـــی حـــەیدەر
نـــەزەر کـــەردەی حـــەبیبی حـــەیی ئـــەکـبەر

حـــەسەن بـــەسری رەیـــیسی ئین تـــەریقەت
حــــــەبیبی عـــــەجەمی شـــێخی حـــەقیقەت

له بــۆ ســەید ئــەحمەدی شــاهی رفــاعی
کــە نــوور دەیـدا لە رووی پـاکـی شـوعاعی
دیگــەر شـێخی بـەدەو یـان سـەیید ئـەحمەد
دیگـــــەر شـــێخ داودی تــــاییی ئــەمجەد
له بــۆ مــەعرووفی کـەرخـی سیڕی سەقەتی
نــــــەجاتی ئـــــۆمەتیان داوه لە ســـــەختی
جـوونەید و شـێخی شـبلی و عـەبدوڕەحمان
ئـــــەبولغەزلی فــەرەج تــەرتووسی ئــەوتان
له بـــــۆ بـــــولحەسەن و بــابا عــەلی هــەم
ســەعیدی مــەخزوومی ئـوستاد مـووعەزەم
له بــۆ قــوتبی زەمـــان مـەحبووبی رەحـمان
رەیـــــیسی ئــەولیا مــەعشووقی ســوبحان
کــە غــەوسی ئــەعزەمە و شـاهی تـەریقەت
کـــە قــوتبی عــالەمە و نــووری حــەقیقەت
ســـــــوپەهسالاری کـــــوللی ئـــــەولیایە
له بـــــۆ شــــێخ و مـــــوریدان پـــێشەوایــە
کـــــە مــــوحی‌یەدین عـــــەبدولقادرە ئــەو
کـــــەسێ هـــــاواری کــــاتێ حــــازرە ئــەو
له بـــــۆ رۆحــــی هــەمان دەریــایی جــاری
مــــحەممەد شــێخ ئــووەیسی یــولبوخاری
مــــووغیسی دەردەمـــەندی و مــوستەمەندی
کـــــە مــەشهوورە بــە شــاهی نــەقشبەندی
له بــــۆ شـێخانی کـوللی تـورق و جــادە
له بــــۆ عـــــەبدوڕەزاقـــــی غـــەوسی زادە

مـــــحەمەد شـــیخ غـــەریبوولئەحوالٚ
لە بـــــۆ عـــەبدولفتاحی کـــاملولحالٚ
مـــحەممەد قـــاسم و ســـادق مـــحەممەد
حـــوسێن بـــەسرای شـێخ لەحسابی ئەحمەد
لە بـــو غـــەوسی دووەم قـــەندیلی نـــووران
کـــە مـــەشهوورە بـــە ئـیسماعیلی وەلیـــان
بە مـوحی یەدین و شـێخی کـۆسە مـەعرووف
وەلیـــعەهدە مـــحەممەد شـــێخی مـەوسووف
دووەم مـــەعرووف شـــێخی بـــازیان خـــوان
بـە سـەید کـاک ئـەحمەدی قـوتبی سـولێمان
لە بـۆ سـەر رووتـی شـێخی چـێهرە پـڕ نـوور
کـــە عـــەبدولقادری ســـەندوولە مـــەشهوور
لە بـــو عـــەبدولعەزیزی مـــەە جـەبینی
وەلیـــــعەهدی تـــــەریقەت ســــەدرەدینی
لە بـــو ئـــەو یـــادگاری وان تـــەمامی
کـــە حـــاجی شـێخ ئـیسماعیلە نـــامی
خـــوداوەنـــدا بـــە حـــەقی مســـتەفا کـــەی
بـــە جـــەمعی مـوورسەل و هـەر ئـەنبیا کـەی
بـــە رۆحـــی ئـــەولیا وهـــەم قـوتبی ئـەعزەم
بە روحمی خـۆت تـۆ ئـەی خـەللاقی عـالەم
بـــبەخشا جـــورم و عـــوسیانی «ئـــەمین» ی
بـــــە حـــــەقی زاتـــی خـــەتمەلموورسەلینی

# وەسفی خانەدانی نەهری:

ئــەی مــوریدانــی تــەریقەت جــارێکی هــەستن بــە عــام
بــا بــچین بــۆ خــاکــی نــەهری ســەر بــڕەهنە بــیلتەمام
بــۆ زیــارەت مــەرقەدی ئــەو مــورشیدی عــالی جــەناب
حــەزرەتی ســەیید تــەهایی پــیری شــەمزینی بــە نــام
بــەڵکە تــا مــاوین لە دونــیا بــۆن مــویەسسەر کــا مــەرام

تــا نــەمردووینە لە دەست خــۆ بــا نــەدەین وێ دەرفــەتێ
خۆ نەجات دەین با هەموو یــەکســەر لــە داخ و حــەسرەتێ
پــیری خــۆن تــێکدا زیــارەت کــەین بــخوازیــن هــیممەتێ
خــۆ لە خــاکــی مــەرقەدان دێ بــۆنی عــەتری جــەننەتێ
چاکە بەو بۆنەی وەها خۆش زوو مــوعەتتەر کــەین مــەشام

غــەوسی ســانی چــوویتە غــوربەت نــائومێدی روئــیەتین
بــێ کــەس و ئــاوارە مــاوین دڵ بــە داخ و حــەسرەتین
رۆژێکــــی خــــۆشن نــــەدیوە دایــما دەر مــێحنەتین
عــومرەکــن رابــرد بــە پــووچی رۆژ و شــەو دەر غــەفڵەتین
مــەست و گــێژ و بــێ خــود و ســەودا ســەرین و زۆر نــەفام

ئــــاورم تـــێ‌بەربووە ســـینەم دەســـووتێ وەک تـــەنوور
گەردشی دەوران لە خـزمەت یـاری خـۆی کـردوومە دوور
هــەر وەکــوو مــەجنوون قـەرارێ نـاگـرم دڵ نـاسەبوور
بــا دڵــی مـەجرووح و قـەلبی نـاتەوان و چـەشمی کـوور
دایـــما مــــەشغوولی دونــــیاو غــــافڵی ڕۆژی قـــیام

بـولبولم عـاشق بـە ڕووی گـوڵ چـاوەڕێی وەخـتی بـەهار
مــەوجی ســـێڵاوی سـرشکم هـەر لە چـاوان دێتە خـوار
چـوو لە دەسـتم سـەبر و هـۆش و عـەقڵ و ئـارام و قـەرار
شـێت و شـەیدایـە ئـەمین و نـائومێدی وەسـڵی یـار
کــوشتەیی عــیشقێ‌یە بـا عـالەم بـزانـن خـاس و عـام

# وەسفی شێخ عەبدولقادری شەمزینان (غەوسی سانی) کوڕی سەید تەها

ئـــەولادی فـــەخرەلمورسەلین شـێخ سـەیید عـەبدولقادرە
ســـولتانی نـــەهری قـوتبیدین شێخ سـەیید عـەبدولقادرە
شەمسی فـەلەک مـاهی زەمـین شـێخ سـەیید عـەبدولقادرە
هـــەم رایـجی شـەرعی مـوبین شێخ سـەیید عـەبدولقادرە
هـــەم بـۆ تـەریقەت جـێنشین شـێخ سـەیید عـەبدولقادرە

شـــەهزادەیـــە عـــالی نـــەسەب ئـــیبنی عـــەلیی مـــورتەزا
نـــەسلی حەسەن نـــووری حوسێن شـاهی شەهیدی کـەربەلا
جـــەددی وی غـــەوسی ئـەعزەمە سـولتانی کـوللی ئـەولیا
روتبەیی وی غەوسی سـانیە هـەم جـێنشینی سـەید تـەها
بـــابی مـــوریدان ئـــەجمەعین شـێخ سـەیید عـەبدولقادرە

سـاداتـی نـەهری ئـەجمەعین شـەهزادەیـە عـالی نـەسەب
ساحیب عەتا و فەیز هەموو هەرچی بکـەی لێیـان تـەڵەب
بـــۆ راەنـــمایی راهـــی دیـــن بـــۆ عـالەمێ بـوونە سـەبەب
دەرمـــانی دەردی هـــەرکەسن لـوقمانی حـالآنن عـەجەب
دەرمـــانی جـــەرگی پـڕ بـرین شـێخ سـەیید عـەبدولقادرە

ئەی شاهی نەهری گیانی من قوربانی خاکی پایی تۆ
کویر بم له بۆ وا خاڵییه ئەورۆ له نەهری جایی تۆ
قوربان شەهیدی غوربەته جەننەت بووه مەئوایی تۆ
سۆفی غەریب و دەربەدەر بوونه هەموو شەیدایی تۆ
دایم دەکەن گریان و شین شێخ سەیید عەبدولقادره

مردم له حەسرەت روویی تۆ ئەی سەروی گوڵزاری تەها
وەڵلا له هیجرانت ئەمین سووتا له دونیایێ وەها
تا زیندەگانی باقی‌یه قەت لەو غەمەی نابێ رەها
خۆ من گەدایی دەرکی تۆم لوتفێ بفەرمووی ئەی شەها
تا کەی دڵم وابێ غەمین شێخ سەیید عەبدولقادره

# وەسفی شێخ عەبدولقادری گەیلانی

با هەموو دەروێش لە خۆ دەن تیغ و شوعلەی ئاگری
وەک بە حووببی دڵ دەکەن هاواری عەبدولقادری
با فیدا کەن، خۆ لە عیشقی شاهبازی ئەولیا
هەر کەسێ وابێ بە وەڵڵا تا ئەبەد قەت نامری
عاشقی غەوس ئەو کەسە، هیچی لە دونیا خۆش نەوێ
دەست لە دونیا و سەر و ئەولاد و ماڵی هەڵگری
مەدحی شاهی ئەولیا هەرگیز بە کەس نابێ تەمام
رۆژی مەحشەر دا دەبینن رەفعەتی ئەسکەندەری
هەر کەسێ دیبی موناقیب زەڕەیێ مەعلووم دەکا
کەشفی سوڵتانی تەریقەت نەسڵی پاکی حەیدەری
ناهومێدی لوتفی وین یا ڕەب نەکەی دەر دوو جیهان
تۆ بە حەقی زاتی خۆت و حورمەتی پێغەمبەری
بەس بڵێ تۆ ئەی ئەمینی رووسیاه و پڕ گوناه
شێعر وانابێ کە دەیڵێی هەر زبانی سەرسەری

# وەسفی غەوسی گەیلانی

ئەمن دەستم بە دامانی تـۆ ئـەی مـەولایی دەروێشـان
ئەمن رۆحم بە قـوربانی تـۆ ئـەی ئـاغایی دەروێشـان
دڵی شەیدایی دەروێشان، قـەرارێ نـاگـرێ یـەکـدەم
بە خۆت تەسکین بدە قوربان، دڵی شەیدایی دەروێشان
تۆ موحیەددینی گەیلانی، ئەتۆی مەحبووبی سوبحانی
تۆ ئارامی دڵ و گـیانی، شـەهی بـەغدایـی دەروێشـان
لە سایەی فەیزی نوورت، ئەی مەهی تابان بـحمداللـه
هەمیشە رۆشن و سـافە، شـەوی یـەلدایـی دەروێشـان
خەریدارانی یـۆسف بـا هـەموویان بـێن و حـازر بـن
لە بازاڕی تـەریقەت دا دەگـەڵ سـەودایـی دەروێشـان
لە گوڵزاری حەقیقەت دا، لە ناو جەمعی گوڵان یەکسەر
ئەتۆی ئارایشی گوڵشەن، گـوڵی یـەکـتایی دەروێشـان
«ئەمین» بۆ زیکر و تەهلیلە،وەکوو حەڵقە دەدەن مەجلیس
مەلیک دێنە تەماشایی سـەف و غـەوغایی دەروێشـان

# مەدحی غەوسی گەیلانی

یا غەوسی موعەزەم بگە ئیمداد و هاوارم
دەرمان کە برینی دڵی مەجرووح و فیگارم
سەیقەل بدە ئاوێنەیی پڕ توز و غوبارم
رۆشن کە چرایێکی لە بۆ ئەو شەوی تارم
ئاڵۆز بووە، لێم ون بووە سەر رشتەیی کارم

تۆ بازی خودا سەروەری ئەقتابی جیهانی
سوڵتانی هەموو شێخ و وەلیهایی زەمانی
سەرمایەیی هەر فەیز و کەراماتی عەیانی
کانی کەرەم و مەعدەنی ئەسراری نیهانی
بۆ هەر دوو جیهان مەرحەمەتی خۆت بکە یارم

مووحیێ لەقەب و ناشری ئەحکامی شەریعەت
ساحێب نەسەب و سەیید و سوڵتانی تەریقەت
موحتاجی تۆ شاهانی مەجازی و حەقیقەت
لەو رۆژی خودا کردی وجوودی تۆ خەلیقەت
بەغدا کوتی من باغم و گوڵ هاتە کەنارم

دەروێشی تۆ هێندەی بە تەریقەت هەیە باوەڕ
ناترسێ لە تیغ بازی و یا خواردنی ئاور
بۆ گرتنی ماران وەکوو شێرانی بەهادور
وەڵڵاهی وەها چاکە موسڵمان ببێ گاور
ئەو زیکرە دەبینێ نەڵێ من ئەهلی کوففارم

ئەی شەمعی شەوی تار و چرای رەوشەنی دینم
پەروانە سفەت بێ بە فیدات گیانی شیرینم
کەلبی دەری تۆم ئەهلی شنۆییمە «ئەمینم»
یادی تۆ بووە مەلحەمی هەر زەخم و برینم
نامی تۆ بووە وێردی زوبان لەیل و نەهارم

# وەسفی غەوسی گەیلانی

ئــەی رەئـیسی ئـەولیایان غـەوسی مـحیەدینی نـام
گەوهەری دەریـایی پـاکـی حـەزرەتی خـەیرولئەنام
شاهبازی دەرگەهی حەق دەسـتگیری خـاس و عـام
دایمە دەروێش و مەحسووبت دەڵێن هەرسوبح و شام
ئەسسەلام ئەیغەوسی ئەعزەمئەسسەلامو سەدسەلام

وەکشـەویمێعراجفـەرمووی‌حەزرەتی‌خەیرولبەشەر
یــــاولد یـــا قـــدرت‌العـــین انت لی نـــورالبـــصر
پێت لە سەر شـانی جـەمیعی ئـەولیایان بـوو مـەقەڕ
ئـــاگـــر و خـــەنجەر بـە دەروێشـانی تـۆ نـادا زەرەر
ئەسسەلام ئەی غەوسی ئەعزەم ئەسەلام و سەد سەلام

گۆشتی زوبحیٚ وێکەویٚ گەر سایەیی دەرگاهی تـوو
ناکوڵیٚ سەد ساڵی خۆش کەی ئاگرەکەی زوو بە زوو
هەم لە بۆ ناری جەهەننەم جوملە دەروێشـان هـەموو
روحمی حەق جاری بیٚ ئـوممێدیان وایـە بـە تـوو
ئەسسەلام ئەیغەوسی ئەعزەمئەسسەلام وسەدسەلام

ئـەی سـەگـانی ئـاستانت شـێر لە دەسـتی وان تـەبا
خــادمانی دەرگــەهت بــالاترئەز ســوڵتان و شــا
ژێـری ئـەقدامـی عـەزیزت شـانی جـەمعی ئـەولیا
گەوهەری بەحری ئیمامان نووری چەشمی مـورتەزا
ئەسسەلام‌ئەی‌غەوسی ئەعزەم ئەسسەلام‌و سەدسەلام

کەی ئەمین دەتوانێ بیکا مەدحی وەسفی شانی تـوو
چاوی تـێبڕیوە بـە دایـم پـێی بگـا ئـیحسانی تـوو
هەم دەوەختی روح کێشانێ دەستی مە و دامانی تـوو
بــنگەیە هـاواری جـارێ گـیانی مـن قـوربانی تـوو
ئەسسەلام ئەی‌غەوسی‌ئەعزەم ئەسسەلام‌وسەد سەلام

# مەدحی غەوسی گەیلانی

قـوتبی فـەلەک و ئـەرز و سـەما حـەزرەتی غـەوسە
شێخی دوو جیهان، بازی خودا، حـەزرەتی غـەوسە
غەوواسـی دوڕی بـەحری بـەقا، حـەزرەتی غـەوسە
سـەرمایەیی هـەر فـەیز و عـەتا، حـەزرەتی غـەوسە
سـەرداری گـروهی شـورەفا، حـەزرەتی غـەوسە

ئەو مـەحرەمی ئـەسراری خـودا مـووحی یەیی دیـنە
ئـەو راهـبەری راهـی هـو دا بـۆمە مـووعینە
شـەهبازی بـرووجی فـەلەک و مـاه و زەمـینە
دەرمـانی هـەموو دەرد و شـەفای زەخـم و بـرینە
فـەریاد رەسـی هـەر زوعـەفا، حـەزرەتی غـەوسە

ئـەوساف و کـەرامـاتی وی خـارج لە شـوماره
دەروێشـێ لە زیکـری دەڵـێ یـا غـەوس هـاوارە
تـیغ بـازی دەکـا، ئـاگـری دەخـوات و دیـارە
نـادا زەرەری نـیشی دوو سـەد عـەقرەب و مـارە
فـەرماندە و سـوڵتانی وەلا حـەزرەتی غـەوسە

ئەی شـانی تـۆ تـەختی قـەدەمی شـاهی دوو عـالەم
شانی هەموو شێخ و وەلی‌یـەک ژێـر قـەدەمت خـەم
خوددامی دەرت خوسرەو و کاووس و کەی و جـەم
ئـــەو قــەلبی بــریندارە بکــە جــارێکی مــەرهەم
بــۆکــوللی غـەم و دەرد و دەوا حـەزرەتی غـەوسە

مردم لە غـەم و حـەسرەت و مـەحرووم لە خـزمەت
ســووتام بــە ئــومێدی هـەوەسی زەوقـی زیـارەت
جــاری بـە نـەسیبم بکـەی ئـەی شـاهی تـەریقەت
با چـیدی ئـەمین نـەمری لە دونـیایی بـە حـەسرەت
دایـم بـە زبـان هـەر دەڵێ یـا حـەزرەتی غـەوسە

# وەسفی سەید تەهای نەهری (پیری شەمزینان)
# کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای غازی

مەنبەعی سیدق و سەفایە خانەدانی سەید تەها
مەعدەنی فەیز و عەتایە خانەدانی سەید تەها
مەلجەئی هەر بێنەوایە خانەدانی سەید تەها
خانەدانی بێ ریایە خانەدانی سەید تەها
مەخزەنی گەنجی بەقایە خانەدانی سەید تەها

سەییدن ئەولادی پاکی، شاهی جەمعی ئەنبیان
شاهزادە و نەسلی خەوواس، شاهبازی ئەولیان
سادق و سافن، لە کاری دین و دنیا بێ ریان
تایری ئەوجی عەلانە، بازی عالی ئاشیان
دڵبەرێکی دڵڕوبایە خانەدانی سەید تەها

موخلیسی ئەو خانەدانە پیر و بورنا و سەبی
نایلی مەقسەد دەبێ، هەر کەس مەرامێکی هەبی
کوێرە بێ چاوی حەسوود و دوژمنی ئالی نەبی
تا قیامەت تێک نەدەی ئەو خانەدانە یاڕەبی
سلسلەی ئالی عەبایە خانەدانی سەید تەها

رایجی ئەمری شەریعەت فەیز بەخشی خـاس وعـام
دورڕی دەریایی حەقیقەت نەسلی پاکـی دوو ئـیمام
گەوهەری بەحری تـەریقەت نـووری دڵهـایی زولام
مەدحی ئەولادی عەلی هەرگیز بە کەس نـابێ تـەمام
لایـقی مـێهر و سـەنایە خـانەدانـی سـەید تـەها

هەم گوڵی باغی حەسەن، نەسلی حوسێنی ئەجمەعین
رەهـنمایی راهـی دیـنن بـۆ عـوموومی مـوسلمین
دەستی مە و دامـانی پـاکـی ئـەو سـەلالەی نـازەنین
مەرهەمی دەردی دڵن، بۆ کوللی دەردان ئـەی ئـەمین
دەر حەقیقەت هـەر وەهـایە خـانەدانـی سـەید تـەها

# مەدحی حەزرەتی سەید تەهای شەمزینی:

ئـەی دڵـی غـافڵ هـەتاکـەی لەم دڵـی پـڕ مـێحنەتە
کەسب و کارت هەر گوناهن، شوغڵ و پیشەت غفڵەتە
خۆ دەزانی دەردی مەرگ و ڕۆح کێشان زۆر زەحمەتە
قەبری تاریک، مەنزڵێکی تەنگ و قووڵ و بێ سحەتە
جـــا بکـــە تـۆبە لە دونـیا، تـا کـوو مـاوی دەرفـەتە

جارێکی هۆشیار بەوە، لەو خوابی غفڵەت ئەی نەفام
عــیبرەتێ بگــرە لە وانـــی پـێشی تـۆ مـردن تـەمام
چەند کەست دیتن کە مردن قەوم و خوێش و باب و مام
خاکی قەبرێ وای رزاندن، مەحوی کردن خاس و عام
مردنت زۆر پـێ کـەمە، تـۆش وا دەزانـی سـۆحبەتە

ئەو عـەزیزانـەی دەبـینی وا لە ژێـر خـاکـی زەمـین
سەد لە تـۆ بـیللا عـەزیزتر بـوون لە دونـیایێ یـەقین
نـــەوجەوانـــانی دلاوەر، گـــوڵ روخـــانی نـــازەنین
بوونە توعمەی مار و مـووران تـا بـە رۆژی ئـاخرین
تێ بفکرە حاڵی وان، ئـەی دڵ لە بـۆ تـۆش عـیبرەتە

وەک مەڕێکی بێ شوانم، سەر بەخۆ بێ کەس دەڕۆم
هەر وەکوو قەقنەس دەسووتێم، دایما هەر خەم دەخۆم
حەزرەتی سەیید تەها، بیللا سەگی دەرگاهی تۆم
بای سەبا بۆنێک لە خاکی مەرقەدت گەربێنی بۆم
بۆم دەبێتە مەرهەمی جەمعی برین و عیللەتە

دڵ دەکێشێ حەسرەتان بۆ عومری رابردوو یەقین
هەم لە بۆ شاری شنۆیە بۆ موریدان ئەجمەعین
کوا خەلیفانی تەریقەت عالمانی ئەووەلین
ئەلویداعیان کرد لە دونیا، یەک بە یەکیان ئەی «ئەمین»
کوو لە پاشی وان نەبێ جەرگ و دڵی من لەت لەتە؟

# مەدحی سەید عەبدوڵڵای گەیلانی زادە «ئەفەندی»

موژدە ئەی دڵ، عەیدی کوردان گەر بزانن هاتووە
یادگاری غەوسی سانی، پشتیوانن هاتووە
سەیید عەبدوڵڵا، گوڵی گوڵزاری عەبدولقادری
نەسڵی پاکی غەوسی ئەعزەم، شای گوڵانن هاتووە
شوکری حەق، ئەی موخلیسانی خانەدانی سەید تەها
نووری شەمعی ڕۆشنایی خانەدانن هاتووە
بوونە دەرمانی نەخۆشان، هات لە بۆ قەلبی سەقیم
حەمدولیلاهی حەکیمی حاڵی زانن هاتووە
چاوی کەمبینا دەبینێ، نووری دیداری چراغ
قەلبی بێ ڕۆحین و زاتی ڕۆح و گیانن هاتووە
نان و سفرەی کەس نەمابوو، زاهیر و باتن وەلی
ساحێبی سفرە و تەعام و نان و ئاون هاتووە
وەک نەخۆشانی شەوی تاری بە ئومێدی سەحەر
نووری سوبحی سادقی وەختی بەیانن هاتووە
خاکی دونیایەت بەسەر،ئەی گورگی نەفسی بەعدەزین
بۆ مەڕی بێ ساحێبی خۆی، وەک شوانن هاتووە
دڵبەری شەوق و نشاتی، هاتە پەرواز و فڕین
دڵڕوبا و دڵڕفێن و دڵستانن هاتووە
ناڵە ناڵی بەس بکە، ئەی بولبولی تەبعی «ئەمین»
غونچەیی پڕ عەتر و بۆنی گوڵستانن هاتووە

# بۆ سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی «گەیلانی‌زادە»

سەبا ئیزهار بکە ئەوڕۆکە ناوم
بەبە قاسید بچۆ کن نووری چاوم
بچۆ بۆ خزمەتی شاهزادەیی من
بچۆ کن غەوسی سانی‌زادەیی من
بچۆ بۆ خزمەتی ئوستادی فازل
موسەممای شێخ عوبەیدوڵڵایی کامل
بچۆ کن یادگاری نادری خۆم
گوڵی گوڵزاری عەبدولقادری خۆم
لە لەفزی من بە قەولی خۆش و شیرین
بڵێ ئەی یادگاری شاهی شەمزین
بڵێ ئەی دوڕی دەریایی سەعادەت
بڵێ ئەی غونچەیی باغی سیادەت
چ ئینسافە موریدان شوبهی بولبول
بناڵێنن لە هیجرانی روخی گوڵ
نەخۆش و بێ حەکیم و دەردە دارم
بە دەرمانی تۆ موحتاجم هەژارم
بریندار و گرفتار و ئەسیرم
زەلیل و بێ کەس و زار و فەقیرم

حــەکـیم و یـادگاری غـەوسی سـانی
ئــەتۆ دەرمــانی دەردی مــن دەزانــی
بە لوتـفی خـۆت عـیلاجم کـە عـەلیلم
لە نــێو شــاری شــنۆیێ زۆر زەلیــلم
نــەزانـم چـۆن بکـەم ئـیزهاری دەردم
بە لێوی ئیشک و رەنگ و روویی زەردم
دەمێ شادم دەمێ مەحزوون و غەمگین
بە بـۆنی مـەرقەدی سـاداتـی شـەمزین
ئـەگــەر چـەند سـاڵە ون بـوە ئـافتابم
بــە حــەمدوللا کــە مــاوە مــاهیتابم
«ئـەمین» چـەند سـاڵە چـاوی نـابینایە
وەلێ ئــومێدی وی نــووری چــرایــە

# وەسفی حاجی شێخ عەلائەدین

ئەی بلووری گەردنت ئاوێنەیی قودرەت میسال
پەرتەوی عیشقت لە قەلبی عاشقان بەرقی شیمال
ئیسمی پاکت سەیقەلی ژەنگی دڵی پڕ قیل و قاڵ
ڕەوشەنی چەشمی موریدان شێخ عەلائی شێخ جەلال
هیممەتێکم بۆ بکەی ئەی یادگاری شێخ کەماڵ

دڵ لە دووری رووی شەمعت، شەو وەکوو پەروانەیە
سەبر و ئارامی نەماوە، بێ هۆش و دێوانەیە
تا ئەتۆی دیوە لە قەوم و خوێشی خۆی بێگانەیە
هەر وەکوو مەجنوون، لە داخت کێو و سەحرای لانەیە
مەسکەنی بۆتە چیا و دەشت و هاموون و جبال

رووم لە بۆ دەرکی تۆ هێنا، ئەی شەهی دارولسەفا
چونکە قوربان زۆر لە خۆمم کردووە جەور و جەفا
هیممەتێکم بۆ بکە تۆ لەم جیهانی بێ وەفا
گەرچی دەردی من گرانە بۆم بخوازە یەک شەفا
با شەو و رۆژێ دڵی من بەس بکاتن ناڵە ناڵ

خانەدانی ئێوە قـوربان، فـەیزبەخشی خـاس و عـام
مـەرقەدی شـێخ هـادی‌یەدین نـووری دڵـهایی زولام
مەقسەدی عالەم لە خزمەت ئێوە حـاسڵ بـوو تـەمام
جارەکی بۆ منی فەقیریش زوو موویەسەر کەن مەرام
تـا نــەمردوومە بــبینم شــادیی شــەوقی ویســال

گەر ئەمین ئەوڕۆکە قوربان زۆر گوناهکارە و ئـەسیم
چــاوی تـێبڕیوە دە لوتـفی ئـەغنیایان وەک یـەتیم
بـۆم تـەمەننا کـە لە خـزمەت خـالقی حـەیی کـەریم
بەڵکە رەحمێکی بکـا پـێم واحـدی فـەردی عـەزیم
دڵ مونەووەر بێ بە نووری رۆئـیەتی مـاهی جـەماڵ

# خۆشەویستی شێخ عەلائەدین

ئەوەڵی مانگی رەجەب بوو هاتمە خاکی خەلان
بۆ زیارەت مورشیدی خۆم شێخ عەلائەدین عەیان
خانەقا ۆ تەکیەم کە دیتن نایەتە وەسف و بەیان
رۆژ و شەو وەقت و سەعات و پڕ بوون بە دائیم مێهمان
سەیید و مەولا و سۆفی دەستە دەستە هەر زەمان

دائیمە مەشغووڵی زیکر و خەتم و تەسبیح و سەلات
مەوعیزەی شەرعیی و فیکر و رابیتە و نەفی و سوبات
یا ئیلاهی تۆ بە حەققی زاتی فەخری کائینات
هەرچی مەنسووبن لە دونیا و لە عوقبا دەی نەجات
دایما پایەندە و عالی بکەی ئەو خانەدان

سایەیی شێخی لە سەر مە دایمە بێ موستەدام
فەیزی ئەنعامی لە بۆ مە رۆژ و شەو بێ بەردەوام
نان و خوانی هێندە زۆرە قەت بنەی نایە تەمام
هەر بەوەی مەعلووم بزانن ئەی موریدی فیکر خام
رسقی غەیبی‌یە دەباری باتین و مەخفی و نەهان

دڵ وەکوو پەروانەیە عاشیق بە دیداری چراغ
دایما بەدزی دەسووتێ جەرگ و دڵ بۆی بوو بە داغ
شەو وەکوو پەروانەیە رۆژێ وەکوو بولبول لە باغ
تالیبی دەرمانی لوقمانە تەنی زار و نەساغ
ئاگری عیشقێیە بەر بوویتە دڵی من بێ گومان

ساحێبی رشتە و کەمەندن،خانەدانی شێخ کەماڵ
گەردنم کەوتە کەمەندی شێخ عەلایی شێخ جەلال
بۆ ویسالی روویی گوڵ ئەی بولبولی شیرین مەقاڵ
تاکوو دەمری وەک «ئەمین« دایم لە دونیایێ بناڵ
خۆشە نالەی عاشقان و زاری و ئاه و فیغان

# وەسفی شێخ عەلائەدین خەلانی، کوڕی شێخ جەلال

ئـــەتۆی ئـەو سـەییدی عـالینەسەب، پـیری جـەوانـی مـن
ئەتۆی شـاهزادەیـی هـادی نـەسەب، شـاهی خـەلانی مـن
ئـــەتۆی حـاجی عـەلائەدین، لەقـەب شـێخی زەمـانی مـن
ئەتۆی ئەو خـۆشڕوویی پـوڕ خـەندەلەب،شـیرین‌زمانی‌من
فیدایی لەفـزی خـۆشت بـێ، سـەر و ئـەولاد و گـیانی مـن

لە دونـــیا ئـــەی گـــوڵی یـــەکـتا، ئـەگـەر داروسـەفا جـێتە
لە حەشرێ جەننەتولمەئوا، بە روحمی حەق لە سـەر رێـتە
ئەوەی مونکیر بـە تـۆ بـێ، بـێ شـعوور و جـاهیل و شـێتە
ئـــــەتۆ لوقـــــمانی دەردانـــی، دەوا و دەرمـــانێکی پـــێتە
بـــدە رەنـــجوور و بـــیماران حـــەکـیمی حـاڵ زانـی مـن

عەوام و جـاهیلی وەک مـن، بـە زاهـیر هـەر ئـەتۆی دیـوە
ئـەوەی کـامیل نـەبێ، یـا خـۆی نـەناسێ، تـۆی نـەناسیوە
لە پێشی کیمیای هـیممەت، کـە ئـاسن هـەر وەکـوو زیـوە
نەزەرکـە سـائیلی دەرگـات، گـەلێک بـێ نـان و بـێ شـیوە
لە خوانی فەیزی خۆت قوربان، بدە لوقـمەک نـیشانی مـن

زەلیـــلی نـــەفسی ئـــەممارە، ئـــەسیری داوی شـــەیتانم
گـــونەهكار و گـــرانـــبار و گـــرفتار و پـــەرێشانم
كـە رووم بـۆ دەركـی تـۆ هـێنا، لە كـردەی خـۆ پـەشیمانم
ئـــەتۆ بـــی مـــەرقەدی شـێخ هـادی‌یەدین، بـیكە دەرمـانم
نـــەخۆشی دەردی عـــوسیانم، تـــەبیبی مـــێهرەبانی مـــن

لە هـێجرانـی گـوڵی روویـەت، وەكـوو بـولبول بـە هـاوارم
فـــەقیرێكی شـــنۆییمە، ئـــەمینی بـــێ كـــەس و كـــارم
بـــە تـــیری عـــیشقی تـــۆ ســـوڵتان عـــەلائەدین، بـرینـدارم
نـــە تـــەنها هـــەر لە دونـــیایێ بـــە دامـــی تـــۆ گـــرفتارم
دە ژێـــر خـــاكـیش هـەتا دەڕزی وجـوودی نـاتەواوی مـن

# مەدحی شێخ کەماڵ:
# تەخمیسی ئەمین شنۆیی لە سەر شێعری قازی خزری

سائیلی دەرگاهی تۆم، ئەی مەعدەنی فەیز و نەجات
تەی دەکەم چۆل و بیابان، تالبی ئاوی حەیات
خۆ دەزانی من فەقیرم، موستەحەقم بۆ زەکات
یاری شاتر بە لەگەڵ من، چون بە ئیخلاس هاتمە لات
یاری خاترنیم بە قوربان بمکە ژێر ئەندازی پات

بولبولم عاشق بە گوڵ، بوومە گرفتاری قەفەس
دیتنی گوڵزار و گوڵشەن، وا دەکەم دایم هەوەس
یادگاری پیری نەهری، هادیی فەریاد رەس
گەرچی شا شەرتی نەکردبوو زیکری لا حەپسی نەفەس
من بە زیکری تۆمە شاغل، نامەوێ ئاوی حەیات

دەردی عیشقی تۆ لە بۆ من وەک ئەنیس و هەمدەمە
بۆنی خاکی مەرقەدی تۆ، بۆ برینم مەرهەمە
شار و نەرزیوێ لە بۆ من بەیتی خوێن و ماتەمە
گەرچی غوربەت بۆ عەزیزانی وەتەن دەرد و غەمە
من کە حوببی تۆم هەبێتن، نامەوێ ئەهلی وڵات

ڕەوشــەنایی هــەر دوو چـاوم، نـووری بیناکـەم ئـەتۆی
دڵ ســــتان و دڵ ڕوبــایی قــەلبی شــەیداکــەم ئــەتۆی
هــیممەتێکم بــۆ بکــە قــوربان، کــە مـەولاکـەم ئـەتۆی
یـــا کــەماڵەدین، کــەماڵی دیــن و دونــیاکــەم ئــەتۆی
بــۆ کــەماڵی نــەقسی دیــنم، ڕەهــبەری یـەوموولمەمات

سککــەیی قــەڵب و ڕەواجــم جـارەکـی سـەڕڕاف بکـە
بـــاقری جــامی وجــوودم وەک بــلووریٚ ســاف بکــە
ســــەیقەڵێکی پــــێدەویٚ قــــوربان وەرە ئــەلتاف بکــە
چــون خــودا فــەرمووی فلاتنهر ئـەتۆش ئـینساف بکـە
ســـائیلم بــۆ جــەننەتی لوتــفت وەرە بــمکە خــەڵات

هەر وەکوو قـەقنەس، بـە نـاری عـیشقی تـۆیە مـن دەژیـم
حــوببی ئــەوڕۆکــە نــیە، ئــیخلاسێکی کــۆنە و قـەدیم
خــۆ مــەحەک دەیـزانـیٚ قـەڵبە یـا ڕەواجـە، زێـڕ و سـیم
ئــاوێنەی قــەلبت لە پــێش چـاوت، بـە ئـەلتافی حـەمیم
ڕاگــــرە و بــــنوارە تــا بــیزانــی مــن ، چــۆنم لە لات

مــن دەزانــم ئــەی دڵــی مــن، تـۆ چ کـارت خـواهـیشە
دیـــــدەیی گــریان و قــەلبی بــیٚ قــەرارت خــواهــیشە
وەک ئــەمینی تـەشنە، ئـاوی خـۆش گـەوارت خـواهیشە
چــون بــە دڵ نــەرزیوەیی، ئــەلتافی یـارت خـواهـیشە
مــەسڵەحەت وایــە، لە بــۆ خــۆت دابـنیشی لاڵ ومـات

# وەسفی خانەدانی شێخ کەماڵ

گەر سوحبەتی شیرینی تۆ من دێتە خەیاڵم
وەک نەی لە بڕینی کۆنی جەرگی خۆ دەناڵم
ئەوساڵە چ قەوماوە کە مەحروومی ویساڵم
عالەم بە تۆ دڵشاد و ئەمن دوور لە جەماڵم
هەر بەختی بەدی خۆمە وەها بۆتە زەواڵم

مەئوایی گوڵی من لە جیهان داری سەفایە
جێی زیکر و موناجات و فیووزات و دوعایە
مەعلوومە بە خۆڕایی دڵی من نەسووتایە
پەروانە ئەگەر عاشقی دیداری چرایە
من عاشقی نووری ڕوخی فەرزەندی جەلالم

مردم شەو و ڕۆژ هێندە بکێشم غەمی دووری
سووتا دڵی زارم لە تەب و تابی سەبووری
ئیزهاری غەمم مەنع دەکا شەرمە حزووری
ئەی بولبول ئەتۆ عاشقی ڕوویی گوڵی سووری
من عاشقی ڕوویی گوڵی ئەولادی کەماڵم.

عـــالەم هـــەموو پـێی زانـــی بـــە ئـــەسراری نـــەهانم
مـــن عـــاشقی بـــالأیی وەکـــوو ســـەروی رەوانـــم
شـــەیدایـــی گـــوڵ و عـــارزی مـــەجبووبی زەمـــانم
مـــەجرووح بـــە تـــیری مـــوژەیی چـــاوی جـــوانـــم
ســـەرگەشتە و حـــەیرانـــی دوو ئـــەبروویی هـــیلالم

ســـەییاد عـــەجەب بـــوومە بـــە دامـــی تـــۆ گـــرفتار
تـــاکـــەی تـــۆ ئـــەسیری خـــۆ دەکـــەی هـــێندە بـــریندار
مـــەحبووسم و یـــەخسیرم و مـــەجرووحم و بـــیمار
ئـــەی جـــانی ئـــەمینت بـــە فـــیدا یـــاری وەفـــادار
لوقـــمانی، حـــەکـــیمی، بکـــە چـــارێکی لە حـــاڵم

# شین گێری شێخ عەبدولقادری شەمزینی

موریدان خاکْ بە سەر خۆ کەن، بکەن فەریاد و ئەفغانێ
لە پاشی شاهی شەمزینێ بگێڕن شین و گریانێ
دڵم هەر وەک کەبابێکی دەسووتێ لێم نەبوو مەعلووم
کە شێخم چی بە سەر هات و لە غوربەت کەوتە زیندانێ
وەیا دەو ئاخرێ لاڵ بم لە دنیایێ ویداعی کرد
یەتیمی هێشتەوە عالەم بە داغ و دەردی هیجرانێ
لە تاریکی غەم و ماتەم، بە سەد حەسرەت دەناڵێنم
فەلەک زاڵم چراغی خانەدانی سەید تەها کوانێ
دەرێغا بۆ گوڵی باغی عوبەیدوڵلایی شەمزینێ
لە بۆ ئەو مەعدەنی فەیز و عەتا و بەحری ئیحسانێ
لە کوێی ئەی شەهسەواری نەسلی پاکی غەوسی گەیلانێ
کە تەکیە و خانەقات ماون بە بێ ساحێب لە مەیدانێ
لە دونیایێ لە بۆ ئاخر نەمردم من ئەوێ رۆژێ
کە دەستی پاکی تۆم قوربان زیارەت کرد لە راژانێ
نەهالی ئالی تەها، نەوجەوانی سەیید محەممەد بوو
کە جەرگی عالەمێ بیللا لە بۆ وی هاتە سووتانێ
لە دونیایێ لە وەسلی تۆ ئەگەر نەومید و بێبەش بووم
وەلی دامانی تۆ دەگرم دە رۆژی حەشر و میزانێ
دەڵێم یا غەوسی سانی من سەگی دەرگاهەکەی تۆ بووم
لە خزمەت جەددی خۆت بۆمان شەفاعەت کەی لە دیوانێ
دەڵێن عەیدی موبارەک هات هەموو عالەم کەیف خۆشن
لە داخی شێخی لێت تاڵ بوو «ئەمین» تۆ عەیدی قوربانێ

# شین گێری شێخ عەبدولقادری شەمزینی

ئـــەی مـــوریدانـــی تـــەریقەت، هـــاتووە ئـــەورۆ جـــواب
ئـــــیختیارم پـــــێ نـــــەماوە لێـــم بـــڕان ئـــارام و تـــاب
زیـــــندەگـــانیم لێ حـــەرام بـــوو، پـــاشی عـــەبدولقادری
غـــەوسی ســـانی نـــەسلی پـــاکـی سـەییدی عـالیجەناب
ئـــەی غـــەریبی دوور ولاّت و ئـــەی شـەهیدی بـێ گـوناه
پشـــتمت تـــێکداشکـــاند و خـــانەت لێ کـــردم خـەراب
ڕۆژی ڕوونـــــاکـــم، لە داخت لێ بـــووە تـــاریکە شـــەو
ئـــافتابی ڕووت بـــزر بـوو کـەوتە ژێـر پـەردەی حـیجاب
وات بـــە نـــاری فـــرقەتێ ســـووتاندم، ئـەی زاڵـم فـەلەک
دێ لە نـــێو کـــوورەی دەروونـــم بـۆنی ســووتانی کـەباب
بوومە مەجنوون، ڕووت و عوریان نـائومێدی وەسـڵی یـار
تاقەتی سەبرم لە دەست چوو لێم حەرام بوو خورد و خواب
جـێ نشینی غـەوسی سـانی، سـەید مـحەممەد نـەوجەوان
مـــەرقەدی پـــاکت لە کـوێ یە مـەنزڵت کـردە تـوڕاب
بـــــولبولی تـــەبعی ئـــەمین لاڵ بـــوو زبـــانی تـــا ئـــەبەد
بـــۆ گـوڵ و بـۆ غـونچەیی گـوڵ نـازەنین فـەرزەند و بـاب

# شین‌گێڕی شێخ عەبدولقادری شەمزینی

سەروی گولزاری حەیاتم شاهی خووبانم لەکوێی
دڵ بریند‌اری هەواتم دەرد و دەرمانم لەکوێی
تەشنەیی جامی ویسالم ئاوی سەبوانم لەکوێی
ئەی تەبیب لێم کە عیلاجێ تۆکە لوقمانم لەکوێی
موونسی قەلبی حەزین و نووری چاوانم لەکوێی

داغدار و دەردەکێشم دایما لەیل و نەهار
ئەشکی خوێنینم لە چاوان بەر سەر و روو دێنە خوار
شاهی نەهری بێ تۆ وەڵلا لێم بڕان سەبرو قەرار
دایما چاوم دە ڕێگای هاتنەوەت دەر ئینتزار
تاکوو دەمرم هەر دەڵێم ئەی جانی جانانم لەکوێی

سەییدی ئەولادی تاها بۆچی چوویە غوربەتێ
سۆفی و مەنسووبی خۆت سووتاند بەداغ و حەسرەتێ
دوور و نیزیک بۆ تۆ یەکن من بە قوربان هیممەتێ
جارەکی بەو هاتنەوەی خۆت کەم بکە لێن ڕەحمەتێ
ئەی چراغی خانەدانی پیری گەیلانم لەکوێی

عــاجزیت قــوربان لە کــێ بــوو حــیکمەتی ئــاخر چ بــوو
هــاتیەوە بــۆ خــاکــی نــەهری گــیر نــەبووی رۆیشــتی زوو
مــەرقەدی پــاکــی دەنــەهریت وا بــە جــێ هــێشتن ئــەتوو
سۆفی و مەحسووبی خۆت سووتاند بە داخی خۆت هەموو
مـــــەرهەمی زەخـــم و بـــرینی قـــەلبی بـــریانم لە کـــوێیی

یـــــادگاری شـــێخ عـــوبەیدوڵلاهی غـــازی دەر جـــیهان
شـــێخ کـــەماڵەدین* بـــوو پـــیر و مـــورشیدی دارولئـــەمان
هـــەم نـــمایندەت بـــە قـــوربان پـیری نـــەرزیوێ** عــەیان
هەر دوویان شاد بوون بە جەننەت مان یەتیم مەنسووبی وان
راحـــەتی گـــیانی «ئـــەمین» و ســـەبر و ســـامانم لە کـــوێیی

* ـ شێخ کەماڵ ـ خەلیفەی شێخ عوبەیدوڵلای غازی.

** ـ پیری نەرزیوێ : خەلیفە مەلاخدر ـ شنۆ .

# شیوەنی پیری شەمزینی

لە کوردان شین و گـریانە، کـە پشـتیوانـی وان رۆیـی
لە نـەهری داد و ئـەفغانە، چـراغـی خـانەدان رۆیـی
لە بەر چاوی مـوریدانـی وەهـا تـاریک بـووە دونـیا
کە رووناکی لە خورشید و لە مـاهی ئـاسمان رۆیـی
لە بۆیە بولبولی شەیدا بـە سـەد حـەسرەت دەنـاڵێنی
کە پاییز هاتە سەر ئەرزی، بەهاری ئـەرغەوان رۆیـی
لە نێو کۆڕی موریدانی،بـووە تـازی و غـەم و مـاتەم
کە شادیی و نشاتی دڵ، لە رووی موڵکی جیهان رۆیی
یـەگـانە یـادگاری سـەید تـەهایی پـیری شـەمزینی
لە دونیا کۆچی کرد یاران لە بـۆ بـاغی جـنان رۆیـی
لە خاکی غوربەتێ وەک بابی حاجی شێخ عوبەیدوڵلاّ
غەریب و بێکەس و زار و شەهید و بێ نیشان رۆیی
ئەمین بـۆ سـاڵی تـاریخی وەفـاتی شـێخ بـڵێ دایـم
فەلەک بۆچ وا شەهی نەهری لە نەهری بۆ نیهان رۆیی

۱۳۴۳ ی کۆچی مانگی

# شین گێڕی پیری شەمزینی

ئەی شەهدی شەوقی رووی تۆ، پەیمانەیی نشاتم
عەتری نەسیمی کووی تۆ، سەرمایەیی حەیاتم
تاکەی میسالی بولبول، ناڵە بکەم لە بۆ گوڵ
بێ تاقەت و تەحەممول، بێ سەبر و بێ سوباتم
لە هیجری روویی یاران، وەکوو هەوری بەهاران
دەڕژێ لە چاوم باران، هەموو وەخت و سەعاتم
شەهیدی غوربەتم رۆ، پەروانەی جەننەتم رۆ
شیرنایی شەربەتم رۆ، غەریبی دوور وڵاتم
لە رۆژی مەحشەرێدا ، لە حەوزی کەوسەرێدا
وەختی خێر و شەڕێدا، ببیە مایەی نەجاتم
«ئەمین» لە ئەم شنۆیە، مەشغووڵی دەردی خۆیە
قوربان فیراقی تۆیە، دایم بوویتە خەڵاتم

# شیوەنی پیری شەمزینی

لە روویی هەر وەک ئافتاب، ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع
ون بوو دە ژێر باری توراب، ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع
لەو قامەتی سەروی رەوان، لەو تاقی دوو ئەبرۆی کەمان
با سەد هەزار ئاه و فیغان، ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع
بێ گەورە ماون خانەقا، ماون موریدان روو سیاه
بێ مورشید و بێ راهنما، ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع
رۆژا تۆ چوویە غوربەتێ، بووم نائومێدی روئیەتێ
دەمکوت بە داخ و حەسرەتێ، ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع
ئەی سەید محەممەد نەوجەوان،ئەی نووری شەمعی خانەدان
پاشی تۆ چبکەم دەر جیهان،ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع
یا رەببەنا، رۆژی حەسیب، لە زیارەتی هەردوو حەبیب
نەیکەی ئەمینی بێ نەسیب، ئەی شاهی شەمزین ئەلویداع

# شین‌گێری شێخ ئیسماعیل بەرزەنجی

لە داخــی شـێخی بەرزەنجی ئـەمین نـێزیکە شـەیدا بـێ
دوعـایێکی دەکـەم یـاران سـەدای ئـامین لە هـەر لا بـێ
ئــیلاهی رۆحــی پـاکـی شێخ ئـیسماعیلی بـەرزەنجی
غەریقی رەحمەتی حەق بێ، بە فـیردەوسی بـەرین شـادبێ
ئــیلاهی مــەرقەدی پـاکـی کـە جـێگای فـەیزە بـۆ عـالەم
بـە لوتـفی غـەوسی ئـەعزەم بەهرەمەندی رۆژی عـوقبابێ
ئیلاهی رۆژی مـەحشەر جـەددی پـاکـی تـۆ شـەفیعی بـێ
کــەسێکی حــوببی ئــەولادی ئــەتۆی دایـم دە دڵ دابـێ
ئـیلاهی هـەر کـەسێ مـونکیر بـە تـۆ بـێ تـا دەمـی مـردن
بە مونکیر بوونی ساداتـان لە دونـیا سـووک و ریسـوا بـێ
ئــیلاهی تــاقە ئـەولادی عــەزیزی تــۆ کــە مـەعرووفە
بــە روتــبە و پــایەیی عــالی دە حــیفزی خــالقی دابێ
ئــیلاهی چــونکە مــەعرووفی عــەزیزت بـۆ فـیدا کـارە
لە دونــیا و قـیامەت حـافیزی وی حــەق تـەعالا بـێ
دەبـــێ ئــەولادی ســالْح خــزمەتی بـابی بکـا دایـم
رەزایــی حــەق رەزایـی دایک و بـابە کـە پـەیدا بـێ
ئــیلاهی هــەر کــەسێ خـزمەت بـە ئـەولادت بکـا دایـم
لە خــزمەت جـەددی پـاکت فـەیزیابێ کـارەکـەی چـابێ
ئــیلاهی چــون لە پـاشی وی نـەما نـووری دوو چـاوانـم
بــە حـەقی غـەوسی ئـەعزەم چـاوەکـانم زوو مـوداوا بـێ
ئــیلاهی چــون «ئـەمین»ی ئـوشنەوی بـێ پشـتیوان مـاوە
لە بـۆ وی جـەددی پـاکت پشـتیوانـی هـەردوو دونـیا بـێ

# شینگێری شیخ ئیسماعیل بەرەزنجی

دیسـان وا بای خەزان بردی عەزیزی گوڵعوزاری من
تەمی داگرت ژیانی من، بووە پاییز بەهاری من
درێغا نەو گوڵێکم بوو، دەگەڵ بادی خەزان رۆیی
بە وێنەی بولبولی خەمبار،برا سەبر و قەراری من
درێغا ئافتابی من هەتا حەشری غرووبی کرد
نەما ئومێدی رووناکی لە بۆ شەوگاری تاری من
درێغا روویی پاکی شێخ ئیسماعیلی بەرزەنجی
لە ژێر خاکی زەمین ون بوو، خرابوو رۆژگاری من
وەرە پەیکی خەیاڵ ئیمڕۆ بڕۆ تا عالەمی ئەرواح
بکە ئیزهاری دەردی من،لە قەولی من،بە یاری من
کە ئەی مورشید لە پاشی تۆ نەما نووری دوو چاوانم
بە تۆ بوو رۆشنایی هەر دوو چاوی ئەشکباری من
لە پاشی مەرگی تۆ قوربان ، نەزانم بۆچی من ماوم؟
رەفیقی بێوەفا بووم و ئەجەل نەیکرد شکاری من
لە پاشی روویی پاکی تۆ شنۆم لێ بۆتە وێرانە
دەگەڵ کێ سەبری دڵ بێنم، بە کێ بێ ئیعتیباری من؟
بە غەوسی ئەعزەمی بەغدا ، بە ئیسماعیلی وەلیانی
بە مەعرووف و بە سەدرەدین، ئەتۆ بووی شەهسەواری من
لە کوێ یارێکی دی وەک تۆ ،لە ئەم دونیایە پەیدا کەم؟
ئەتۆ ئاوێنەکەی دڵ بووی، گوڵی عالی تەباری من
هەزاران شوکری حەق بێ ،تاقە ئەولادی عەزیزی تۆ
دەگەڵ من ساحێبی لوتفە، لە بۆ هەر کار و باری من
ئەمینی ئوشنەوی مەشموولی مەرگە، پیر و مەعلوولە
لە رۆژی مەحشەری قوربان، شەفیع بە بۆ فشاری من

# شین‌گێری شێخ سەدرەدین

وەکــــوو بــولبول دەنــاڵێنم، گــوڵی بــاغی زەمــینم رۆ
هــەموو عــالەم دەسـووتێنم، دەڵـێم شـێخ سـەدرەدینم رۆ
دەڵێم ئەی مورشیدی من رۆ، دە جـەرگت خسـتووم بـۆسۆ
ئـەمن چ بکـەم لە پـاشی تـۆ، کـزەی جـەرگی حـەزینم رۆ
مورەویج بۆ شەریعەت بووی، دوڕی دەریای حەقیقەت بووی
وەلیــعەهدی تــەریقەت بـووی، رەئـیس و جـێ‌نشینم رۆ
چــراغــی خــانەدانێ بـووی، شـوعاعی بـازیانێ بـووی
گـوڵی نـاو گـوڵستانێ بـووی، وەنـەوشەی فـەروەردینم رۆ
ئــەتۆ بــێ مـەرقەدی پـاکت، بـنێرە عـەتری سـەرخـاکت
لە بــــۆ دەروێشـــی غــەمناکت نشــاتی دڵ غــەمینم رۆ
یەتیم ماون هەموو دەروێش، برا و ئەولاد و قەوم و خـوێش
بــرینداره دڵــی پــڕ ئــێش، دەوای زەخــم و بــرینم رۆ
«ئەمین» مـاوە لە هـیجرانت، لە حـەشرێ دەگـری دامـانت
ســـەر و مـــاڵی بـە قـوربانت عــەزیزی نـازەنینم رۆ

# شین‌گێری عەبدولعەزیزی سەدرەدین

بـــناڵە ئــەی تــەز رەوی دڵ، هــەتا مــاوی لە دونــیایێ
بــەهارت لێ بــووە پــاییز لە داخــی ســەروی بــاڵایێ
لە بــۆ هــەر بــولبولان فــەسڵی بـەهاران گـوڵ دەبـن پـەیدا
گــوڵی مــن جـارێکی دی نـایەتە سـەر روویـی دونـیایێ
گـوڵم عـەبدولعەزیزی سـەدرەدین بـوو و پـیری نـوورانـی
وەلیــعەهدی تــەریقەت جــێ‌نشینی غـەوسی بـەغدایـێ
لە وەخـــتی نـامرادی جــوملە دەروێش و مــوریدانــی
لە دونــیا کـۆچی کـرد رۆیـی لە بـۆ فـیردەوسی ئـەعلایێ
چـــراغـــی خــانەدانــی شــێخ ئــیسماعیلی وەلیــانی
نــەهەنگی بـەحری عـیرفانی حـەقیقەت دوڕڕی دەریـایێ
لە هیجری رووی گـوڵت قـوربان وەکـوو بـولبول دەنـاڵێنم
فــەلەک لێکــی جـودا کـردین کـە دیـدار کـەوتە عـوقبایێ
مــوریدانت هــەموو سـووتان لە دەردی داغـی هـیجرانـێ
خسووسەن من ئەسیری خەم، جنوونی دەشت وسـەحرایـێ
لە رۆژی مـەحشەرێ مـەولا لە خـزمەت فـەخری عـالەمدا
زیــارەت کــردنت دەیکـا «ئـەمین» لە خـودای تـەمەننایێ

# شین گێری شێخ سەدرەدین

ئەی موریدان خاک بە سەر کەن ئەجمەعین
بۆ وەلیعەهدی تەریقەت، سەدرەدین
جا دەخۆ بەردەن هەمێشە ئاگری
بۆ وەکیلی شاهی عەبدولقادری
بۆ چراغی خانەدانی بازیان
بۆ رەئیسی عابدان و زاهیدان
ئەی دریغا بۆ گوڵی گوڵزاری دین
ئەی دریغا بۆ عەزیزی نازەنین
ئاورم ئەورۆ دە جەرگی بەربووە
پیری دەروێشان وەفاتی کردووە
ئاخ لە بۆ دوو چاوی حاجی سەدرەدین
تا قیامەت کەوتە ژێر خاکی زەمین
سەییدی نەسلی حوسێن ئیبنی عەلی
یادگاری شێخ مەعرووفی وەلی
ئەی هەزاران وەک «ئەمین» قوربانی تۆ
رۆژی مەحشەر، دەستی من دامانی تۆ

# شین‌گێڕی حاجی سەدرەدین

له سوْزی ئاتەشی جەرگم، زەمین و بەحر و بەر سووتا
له دەوری مەشغەڵی جەرگم، گیاهی خوشک و تەر سووتا
سەحابی ئەبری نیسانیٚ، له چاوم فێر بووگریانیٚ
دڵی سەد کووره و گوڵخەن، له بوٚ من سەربه سەر سووتا
له هیجرانی وەلیعەهدی تەریقەت، کوێر بووه چاوم
له داخی حاجی سەدرەدین، دڵ و جان و جیگەر سووتا
له بەر سێلاوی چاوانم، هەموو عالەم بووه توٚفان
له بەرقی نالەیی گیانم، هەموو شاخ و حەجەر سووتا
جەمالی ئافتابی پیری دەروێشان غورووبی کرد
له بوٚیه دڵ ده ژوورێدا، وەکوو شەمع و فەنەر سووتا
وەفاتی حەزرەتی شێخی، کە پەیدا بوو له دونیایێ
بە وەلـلاهی هەموو عالەم، له داخی ئەو خەبەر سووتا
«ئەمین» فەسڵی بەهاران، وا له دەردی دڵ مەناڵێنه
له نالەی بولبولی تەبعت، گوڵی باغ و شەجەر سووتا

# وەڵامی نامەی شێخ عەلاوەدین

گوڵی باغی کەماڵەدین فیدایی چاوەکانت بم
جگەرگۆشەی جەلالەدین بە قوربانی مەکانت بم
هەمێشە مونتەزیر بۆ هیممەتی تۆمە هەتا دەمرم
فیدایی خانەقاە و مەسجد و حوجرەی خەلانت بم
دوو سەد جارم زیارەت کرد لە شادی،نامە و قاسید
بە قوربانی خەتی سەر کاغەز و ئیمزای جوانت بم
لە روویی مەرحەمەت حاڵی منت پرسیبوو ئەی مەولا
فیدایی لەفزی خۆش و شەککەرین شیرین زوبانت بم
ئەگەر خالق بکا قسمەت بەهارێ نییەتم وایە
دەگەڵ یار و رەفیقان بێمە خزمەت مێهمانت بم
بە نووری شەمعی روخسارت بکەم رۆشن شەوی تارم
لەدەرکی خانەقات هەر شەو وەکوو سەگ پاسەوانت بم
«ئەمین» حەڵقە بە گۆشی خانەدانی هادییەدینە
لە رۆژی مەحشەرێ مەولا لە زومرەی خادمانت بم

# شینی «ئەمین» بۆ ئازیزەکەی

لەکـۆیی ئـەی رۆشـنی نـووری چـراغـی خـانەدانـی مـن
لەکۆیی ئەی دڵبەری مـەجبووب و یـاری مـێهرەبانی مـن
لە رۆژێ ئەی گوڵی یـەکـتا جـودا بـوویتی لە پـێش چـاوم
بـــە مـــەرگی تـــۆ بـــووە پـــاییز بـــەهاری گـــوڵستانی مـن
هەزار ئەفسووس و سەد حـەسرەت لە ئـەییامی جـەوانـیدا
لە دونـــیایێ ویـــداعت کـــرد ئـــەنیس و نـــەوجەوانـی مـن
لەکـوێ یـارێکی دی وەک تـۆ لە ئـەم دونـیایە پـەیداکـەم
ئـــەتۆ ئـــاوێنەیی دڵ بـــووی رەفـیقی خـۆش زوبـانی مـن
ئەگەر نەقشی روحـی پـاکت بـە ئـاوی زێـڕ بـنووسم مـن
روحـێ بـۆ تـۆ لەکـوێ بـێنم، ئـەرێ رۆحـی رەوانـی مـن
لە پاشی تۆ بـە مـەرگی تـۆ چ خـۆشیم قـەت نـەدی رۆژێ
بـــووە زیــندان لە پـێش چـاوم هـەمێشە خـان ومـانی مـن
«ئەمین» گەر لەم جیهانەی بێ وەفا نـەومیدی وەسڵت بـوو
دە قەسری جـەننەتێ یـاڕەب دەگـەڵ تـۆ بـێ رۆژانـی مـن

# بۆ میرزا مرادی شاعیر

مـرادی مـن، مـرادی مـن لە ئـەحواڵـی تـۆ پـرسیارە
مـرادم هـێندە بـوو کـوتم مـرادی مـن نـە ئـەشعارە
ئەتۆ رۆژێکی پار هاتی لە بـۆ بـاغی ئـەمینی خـۆت
«ئەمین» ئەو ساڵەکەش دیسا مـرادی رۆژێکـی پـارە
دەگەڵ دەروێش محەممەد دادەنیشین وەک لە باغی دا
مرادن هەر دە دڵ دایە ئەگـەر چـی دوورە لەم شـارە
مراد ئـەوساڵ «ئـەمین»ت بـێ مـراد و دڵ پـەرێشانە
لە کەسب و کار و ئەوزاع و لە ئەحواڵـی خـۆ بـێزارە
پەرێشان خـاترە، مـەحزوونە، ئـەشعاری لە بـۆ نـایە
بـە دامـی بـووستان و بـاغ و تـووتوونی گـرفتارە
لە راوێـژان دیـارە پـێشرەفتی مـەقسەدی نـابێ
بە زاهیر تالیعی بەرگەشتەیە، کـاری چـەپ و خـوارە
نـەزانـم تـۆ چـلۆنی بـەرمرادە عـەیشی دەورانت
وەیـائینکی مـرادیش وەک «ئـەمین»ی دڵ بـریندارە
زەمانە چونکە بێ مێهرە دەگەڵ ئـەهلی هـونەر بـۆیە
هەمێشە هەر دەگەڵ زومرەی عەوام و جاهیلان یـارە
عەوامی بـەختەوەرە دایـم بـە نـاز و نـیعمەتی شـادە
ئـەدیبی بـەختبەرگەشتە لە هـەر لا دەسـتی بـێکارە
ئەگەر نەقسی هەبێ شێعری «ئەمین»ی عەیبی لێ مەگرە
غـــەریقی بـوستان و بـاغ و بـادمجان و بـیبارە

شـــــیرینە مـــــراد* هـــەموو ئـــەشعار و کـــەلامت
یـــارەببی ئـــەدا بـــێ هـــەموو مـەقسوود و مـەرامت
ئەو شەو کە شەوی قەدر و شەوی جومعە لە مەسجید
بـــــووم مـــــونتەزیری هـــاتنی پـــەیغام و پـــەیامت
نـــەمزانـــی چ بـــاعیس بـــوو بـــرادەر کـــە نـــەهاتی
ئەی یاری عەزیز ئەوشۆ لە کوێت کرد بوو ئـەقامەت
نـەومید بـوو «ئـەمین» گـەرچـی لە دیـداری مـرادی
یاڕەب لە بـەلا دوور بـێ، وجـوودت بـێ سـەلامەت

*ـ میرزا مراد، شاعیرێکی شنۆیی بووە.

## ئەم قەسیدەیە «ئەمین» لە زمان میرزا عینایەت بۆ خزمەت کاک مستەفا ئیرانی «سافی» نووسیویە:

وەرە پەیکی سەبا ئیمڕۆ بەبە قاسیدی فەرمانم
بچۆ بۆ خاکی ئێرانی لە بۆ کن گیانی گیانانم
بڵێ ئەی کاکە مورشید نووری چاوم کوڵەکەی دینم
لە بۆ ناپرسی جارێکی لە ئەحواڵی پەرێشانم
تەبیبی حاڵ زانی من بە دەرمانی تۆ موحتاجم
نەخۆش و پیر و ئوفتادە ئەسیری دامی هیجرانم
بە مووی ئاوا سپی، قەلبی وەها ڕەش هەروەکوو یەعقووب
بە بۆنی نازەنینی خاکی ئێرانی دەژی گیانم
ڕەفیقم کەس نەما ڕۆیین لە دونیا هەر ئەمن ماوم
ئەمیش مەشموولی مەرگم ئینتیزاری ڕوحمی ڕەحمانم
وەلی دەو ئاخری عومرم چ ئینسافە لە تۆ دووربم
حەبیبی من تەبیبی من، دەوایی دەرد و دەرمانم
ئەتۆ بێ مەرقەدی کاکی بە لوتفی خۆت عیلاجم کە
بە بۆنی پیرهەن بیکە موعەتتەر بەیتولئەحزانم
قەرار و وەعد و پەیمانم دەگەڵ تۆیە هەتا دەمرم
ئەمن حەڵقە بە گۆشی تۆم، لە سەر ئەو عەهد و پەیمانم
وەلی ئەو حەسرەتەم ماوە هەتا ماوم لە دونیایێ
زیارەت خاکی پایی تۆم نەسیب بێ شاه و سوڵتانم

عـینایەت ئـارەزووی لوتـف و عـینایاتی هـەیە قـوربان
هــەموو عــالەم بــزانـیٚ مـن غـولامی کـاکـی ئـیرانـم
رەفــیقیٚکم هــەیە وەک مـن بـە ئـەلتافی تـوٚ مـوحتاجە
ئـەمینی ئـوشنەوی نـاوە، بـە خـوٚشی خـزم و جـیرانـم
لە دونــــیا و قــــیامەت بــنگەیە ئــیمداد و هــاواریٚ
لە بن بـەیداخـی غـەوسی ئـەعزەم و سـولتانی جـیلانم

# بۆ سافی «کاکی ئێرانی»

سافی بە فیدای خاکی دەری ڕەهگوزەرت بم
قوربانی قەد و قامەت و لەفزی شەکەرت بم
حەیرانی کەلامات و غەزەلیاتی تەڕت بم
شەیدایی کەڕاماتی سەریعولئەسەرت بم
پەروانەیی جان دادەیی شەمعی نەزەرت بم

پەروانەمە ئەمما لە چرای روویی تۆ دوورم
وەک بولبولی مەحرووم لە روویی گوڵی سوورم
سەد شوکر بە ئەفکار هەمێشە لە حزوورم
ناچار بە ئەم حاڵەشەوە شاد و سەبوورم
دەروێش و قەلەندەر بە تەمەع سیم و زەڕت بم

من سائیلی دەرگاهم و موحتاجی بەراتم
موشتاقی دوعایەکم لە بۆ راهی نەجاتم
بەو لوتف و سەفای دڵ وەرە تۆ بمکە خەلاتم
فەوتاوە دەعوسیانێ هەموو عومری حەیاتم
خاکم وەسەری کەنگێ دەبێ خاکی دەرت بم

یارەب کەی دەبێ جارێکی من بێمە خـەیاڵت
یــائینکی بــبینم بــەنەزەر مــاهی جـەماڵت
ڕۆژێکی بکەم روئیەتی ئەو ئـەبرۆی هـیلالت
شاد بێ دڵی غەم دیدە لە بۆ عەیدی ویســالت
زەواری تــوڕابـی قـەدەم و پـا و سـەرت بـم

بێچارە «ئـەمین» م لە شـنۆ بـێ کـەس و کـارم
بێ دولبەر و بێ هەمدەم و بێ مـوونس و یـارم
تۆ غەوسی موعەززەم بگـە ئـیمداد و هـەوارم
دەرمان کـە بـرینی دڵـی مـەجرووح و فـیگارم
ئەی من بە فیدای مەرهەمی زەخمی جگەرت بم

# بۆ جوانەمەرگ «نازدار» کچی ئەمین

له پــاشی روویــی مـەحبووبان له دونـیا گـوڵ نـەمێنێ بـا
له پــاشی رووی گـوڵان، بـولبول له بـاغانْدا نـەخوێنێ بـا
گوڵی روویی جەوانان وەک له ژێر خاکـی زەمـین ون بـوو
دەنــا رووییـی گـوڵ و سـونبول بـەهاران کـەس نـەبینی بـا
وەکوو بادی ئەجەل غـونچەی مـنی ئـەوڕۆکـە فـانی کـرد
بـلێن بــا بــاغەوان چــیدی له بــاغان گـوڵ نـەچێنێ بـا
چەمەن وا مانەوە بێ گوڵ هەزار ئەفسووس و سەد حەسرەت
بـلێ بـا غـونچە گـوڵ چیدی له پـەردە خـۆی نـەژینێ بـا
جــەوان و نــازەنینی مــن له دونــیایێ ویــداعــی کــرد
له پــاشی وی «ئــەمین» یــاڕەب له دونــیایێ نــەمێنێ بـا

# بۆ میرزا عەبدوڵڵای عینایەتی سعات ساز

ئـــەی بـــادی ســـەبا ئـیمرۆ، قـاسید بـە دەفـەرمانم
بۆ خزمەتی سۆفی خۆن، ئـەو نـووری دوو چـاوانـم
ئـــەو مـــوونسی غـەمخوارم، ئـەو عـاقڵی هـوشیارم
ئـــەو یـــاری وەفـــادارم، خـــزمی مـــەوە جـــیرانـــم
ئەو مەحرەمی هـەر رازم، مـیرزایـی سـەعات سـازم
عـــەرزی بکـــە داخـــوازم، ئـــەحواڵـــی پـــەرێشانم
مانگی رەمـەزانـیٚ هـات، مـەنزڵ بـووە نـێو بـاغات
بـیٚ بـانگی و بـیٚ سـاعەت، پـارشێوی خـۆ نـازانـم
قـــیرەی کـــەڵەبابم دیٚ، زوو ســـفرە و ئـــاوم دیٚ
وەک خواردم و خـوابـم دیٚ، دەیـخۆم و پـەشێمانم
یـــارەبی شـــەوی مـــاوە یـــا کـــازیوەی کـــێشاوە
چـــان دێـمی نـەکـێشاوە، دەنگـێک دیٚ لە گـوێیانم
وەعدەت بە سەعاتێک دا، هەر چـەندی لە بـاغی بـم
مـــن مـــونتەزیر ئـیمرۆکـە، بـوو وەعـدە و پـەیمانم
گەر ساعەتی زەنگی بیٚ، هەر وەختەی کە دەنگی بیٚ
مـــەعلووم دەبـــیٚ کـــەنگیٚ بـــیٚ ئـــەمجارە سـبەینانم
ئـــــەو ســـــاڵە ئـــەمینی تـــۆ کـــەوتۆتە غـــەریبایی
رۆژیٚ دڵـــی خـــۆشحاڵە ئـــەمما شـــەویٚ زیـندانـم

# بۆ میرزا عەبدوڵڵا عینایەت «سەعات ساز»

سۆفی نەتزانیوە، دیسا ئیمرۆ لێم تێک چوو سـەعات
کەس نیە خۆشم بوێ، ئەو چەپرەکەی بیکەم خەڵات
جار بـە جـار فکـرێ دەکـەم، یـاری قـەدیمە لازمـە
حـــورمەتی بگـــرم، لە نـــاو بـێگانە و ئـەهلی وڵات
پـــیرە بـــێچارە، ددانـــی نـــینە، مـــەعدەی شـــوڵغە
قورمیشی دەخوا، هـەزم نـاکـا خـوا چـارەی بکـات
هەر وەکوو پیران شەوێ، تا ڕۆژێ سەد جاری تەمام
دەنوێ و کارێ دەکا، دیتت کە بێ دەنگ بوو و مـات
هەر وەکوو ساحێبی خۆی، گە ساغە وگاهی دڵ بە غەم
باتنی ژەنگ و قەساوەت، زاهـیری سـەوم و سـەڵات
چونکە زۆر خۆشم دەوێ حەیفە لە خۆمی کەم جودا
مەعدەکەی گیراوە، قەبزە، کـارێ نـاکـا نـاردمە لات
تۆ حەکیمی حاڵی وی، مەولایی تۆش بۆ حـاڵی مـن
تۆ بەجەددی شێخی خۆت بمدە بە یەکجاری نەجات
ناوزگی خاوێن کەوە، بـا بـەس لە خـۆی غـافڵ بـبێ
ئوجرەتی وی حازرە، چـەندی بـڵێی بـیکەم بـەرات
ئــەی «ئـەمین» ئـوستا دەزانــێ، بـۆ سـەعاتی لازمـە
بۆ چی ناچیە خـزمەتی، تـا بـتدەنێ ئـاوی حـەیات

## هاتنی فەلەکان بۆ شاری شنۆ

وەک دوژمــنی دیــن، پــار پــاییزێ هــاتە ولاّتــم
بــۆ ورمــێ، لەگــەڵ ئــەهل و عــەیالی خــۆ هــەلاّتم
زســتانێ عــرووس رۆیــی و پــەیدا بــوو نــەشاتم
وا تــێدەگــەیشتم کــە بــە کــوللی بــوو نــەجاتم
نــەمزانــی فــەلە بــۆتە ســەبەب قــەتعی حــەیاتم

ڕۆژێکی عەجەم کردی بە شەڕ ئەی گەلی یاران
ئــەو ئــەرمەنیی گــاوڕی مــەلعوون، وەکــوو ماران
دایگــرتینە بــەر تــۆپ و تــفەنگان وەکــوو باران
مەجبوور بوو عەجەم، کردی دەخالەت وەکوو جاران
جــا بــۆ غــەمی دڵ، هــاتە ڕەقــەم قسمی بــەراتــم

هەر چەندی سلاحی کە عەجەم هەیبوو لە مالاّن
نــاو مــاڵی ئــەوەی هــەیبوو لە مالاّن و لە چالاّن
تــێک را فــەلە بــردی ئــەوی دەیــزانــی بــە تالاّن
نــەمدیوە ئــەمن کــاری وەهــا قــەت بــە چ سالاّن
نــەمزانــی کــە کــووم رابــوارد وەخت و ســەعاتم

سەد مالّی شنۆیی لەوێ حازر بوو بە دەفتەر
بۆ قەتڵی هەموو کوردێ، فەلە شووبهی غەزەنفەر
ڕۆژێکی لە بۆ کوشتنی مە ئەمر درا سەر
بەر بوونە دەر و کووچە و بازاری سەراسەر
گۆتم دڵی غافڵ ئەوە نزیک بوو وەفاتم

سبحەینێ بوو هەشت نۆ فەلە هاتن وەکوو ئاگر
دەروازەکەیان ورد و پەراش کردم و کافر
لێم هاتنە حەسارێ بە تفەنگێ وەکوو ساحر
چواران منیان گرت کە پارەی بدە حازر
رووح هاتە سەری لێوم و چوو سەبر و سەباتم

پاڕامەوە گۆتم، بە خودا نیمە چ پارە
گوتیان بدە پارەی نەخۆ دەتکەینە دووپارە
رایان دەکێشام بۆ تەویلەی وەک سەگی هارە
دیتیان گەلێ ئەسباب لە وەتاغی مە دیارە
هەر چوار دەرپەڕینە سەرێ ئەو جا بوو نەجاتم

دیتم لە تەویلەی هەبوو سوراخی بوخاری
دایاندڕیبوو زۆر فرەوان بەینی دیواری
هەڵچووم بە حەوا دا وەکوو مار هەڵچێ بە داری
بانێکی نەوی پێوە نووسابوو بە کەناری
ئەو بانی نەوی بوو بە حەسار و بە قەڵاتم

عــەبدێکی ئــەگــەر حــیفزی بکــا خــالقی یــەکــتا
ئــەسبابی دەکــا بــۆ لە هــەموو لایــەکــی پــەیدا
دیـــتم قــەرەوڵ هــات و ئــەمنیان زوو دەرێـنا
بــردیانە قــەڵای ســاحێبیان هــەرچی هــەبووین جــا
ئــاسوودە لە دەست کــوشتن و غــەوغا بــوو نــەجاتم

پێنج مانگی رەبەق مــاینەوە نــێو حــەپسی حــەساری
تــــا لەشکــری تــورکانن لە پــڕ هــاتە هــاواری
قــڕانــی « فــەلانە» لە هــەموو کــووچە بــە جــاری
هـــاتینەوە شـــاری شـــنۆ ئـــاخری کـــاری
وەمــزانــی «ئــەمین» تــازە دەیــاندامــی حــەیاتم

# غارتگەری هۆش

نەمدیوە وەکوو تۆ کەسێ وا دلبەر و رەعنا
روومەت گوڵ و موو سونبل و چاو نەرگسی شەهلا

خۆش رەنگ و قەشەنگ و بەنەزەر شەنگ و دەهەن تەنگ
سوورەت قەمەر و لەب شەکەر و ئاوێنە سیما

نازوک بەدەن و سیم تەن و سینە سپی و ساف
شیرین دەهەن و خۆش سوخەن و شۆخی دلارا

عەییار و دڵ ئازار و ستەمکار و جەفاکار
غارەتگەری هۆش و خیرەد و تاقەتی دڵها

من سەیدی چ دامێکی نەبووم کەوتمە دامت
پا بەندی بە زنجیری سەری زولفی سەمەن سا

بولبول وەرە تا مردنێ هەر تێکڕا بناڵین
تۆ بۆ گوڵ و من بۆ دەهەنی غونچەیی یەکتا

پەروانە وەرە تاکوو دەگەڵ یەکدی بسووتێین
تۆ عاشقی شەمعیی و ئەمن عاشقی لەیلا

کەس قیمەتی ئەشعاری ئەمینی لە شنۆیە
نازانێ مەگەر شەخسێکی زۆر عارف و دانا

# رەقیب

دڵــم نـــاپشکوێ بــێتوو نــەبیسم رۆژێ مــن نــێوت
سەر و ماڵم بە قوربانی شەوێکی مــاچی ســەر لێــوت
ئیلاهی ، کەی دەبێ سەروی قەدت بگرم بە ئاغووشم
ئیلاهی کەی دەبێ بۆن کەم، دوو پستانی وەکوو سێوت
ئەگەر سەبرێ بکەم، لەو دەردی بێ دەرمانی تۆ گیانا
دەبێ هەڵوا بخۆم، جارێ لە قــۆرەی قــایمەی مــێوت
وەکوو ئاوی حەیاتێ، عومری تازە بۆم دەبێ حــاسڵ
دە زاری خۆم بنێم من، گەر زەنەخدانی وەکوو زێوت
بە ئاوی چاو و بەرقی ئاه و نــاڵە، خــۆم دەســووتێنم
خودا تۆفیق بدا ئاخر، خەمی قورسی وەکوو کــێوت
ئەمین فکری جودایی، قەت لە تۆ هەرگیز نەبوو ئەمما
خودا ماڵی خــراکــاتن، رەقــیبی هــەر وەکــوو دێــوت

# ئاهی دەروون

عاشقی رووی یارەکیمە، یارەکەی روخ وەک قـەمەر
مـــوبتەلای بـــازارەکـــیمە، بـوٚ مـەتاعی دیـن زەرەر
تەن دەگەڵ پەروانە جووتە قـەسدی سـووتانیٚ دەکـا
دڵ دەگەڵ شەمعیٚ برایە شەو دەسـووتیٚ تـا سـەحەر
دووکـــەڵی ئـاهی دەروونـم شـاهیدی سـووتانی دڵ
مەوجی چاوی پڕ لە خوێنم، باعیسی زەخمی جگەر
ئەو کەسەی پێی شادە دڵبووم، لێی جوداکردم فەلەک
نووری چاوانم لە کوێیە، کوێوە چوو خاکم بـە سـەر
شادیی دیداری توٚم ئەی گوڵ موبەددەل بوو بـە غـەم
وەسڵی توٚم لیٚ بوو بە هیجر و حەسرەت و ئاه و کەسەر
شەو لە هیجری روویی توٚ، ئەی مایەیی رووحی رەوان
سینە سووزان، دڵ فرووزان، دیدە گریان، چەشمی تەر
ناڵەیی جانسووز و ئاهی شوٚعلە ئەفرووزی «ئـەمین»
بوٚچ لە توٚ ئەی سەنگ دڵ، هەرگیز نەبوو جاریٚ ئەسەر

# فەلەک

بۆ چی دوو ساڵە دەگەڵ من وا بە کینی ئەی فەلەک
هێندە بۆ دەرهەق بە من وا نا ئەمینی ئەی فەلەک
حەسرەت و داغ و خەمت هێند کردمە یار و رەفیق
سەد کونت خستووتمە جەرگی پڕ برینی ئەی فەلەک
گە غەمی دینی دەکێشم، گا غەمی ماڵ و مناڵ
گا غەمی داغی فیراقی نازەنێنی ئەی فەلەک
شاری خۆش ئاب و هەوام لێ بۆتە زیندانی بەلا
چاکە چیدی لەو ولاتە نەمژیێنی ئەی فەلەک
تاقەت و سەبرم لە دەست چوو خانەیی عومرم رما
بەسە هێندە داغ و دەردی دڵ حەزینی ئەی فەلەک
بۆ هەموو عالەم دەباری هەرتەرەف بارانی غەم
یا لە نێو شاری شنۆیی بۆ «ئەمینی» ئەی فەلەک

# دڵی غافڵ

لە ئـەم دنـیایی فـانیدا هـەتاکـەی ئـەی دڵـی غـافڵ
لە ناو مەستی جەوانیدا، هەتا کـەی ئـەی دڵـی غـافڵ
تەماشا باب و باپیران، ئەگـەر بـورنا و ئـەگـەر پـیرن
دە خاکیٚ دا چ یەخسیرن، هەتا کەی ئەی دڵی غـافڵ
تـەماشا مـوونس و یـاران، دە قـەبریٚدا گـرفتارن
هەموو خەستە و بریندارن، هەتا کەی ئەی دڵی غـافڵ
ئەگەر شیٚخی ئەگەر عالم، ئەگەر مەعلوولی گەر سالم
دە ئاخر دەمری ئەی زاڵم، هەتا کەی ئەی دڵی غـافڵ
بە سەد تەدبیر و سەد رایـیٚ، عـیلاجی مـردنیٚ نـاییٚ
دەبیٚ کوٚچ کەی لە دنیاییٚ، هەتا کەی ئەی دڵی غـافڵ
تەنی وا نازوکت دەرزی، دەژیٚر خاکی سەری ئەرزی
لە ترسان بوٚچی نالەرزی، هەتاکەی ئەی دڵـی غـافڵ
ئەمین جاریٚ بکە توٚبە، لە خورد و نوستن و خەو بـە
لە بوٚ توٚش دیٚتن ئەو نوٚبە، هەتا کەی ئەی دڵـی غـافڵ

# سکاڵا

فەزیحەت قەت لەوەی زۆرتر دەبێ ریسوایی عالەم بم
موسیبەت قەت لەوەی بەدتر دەبێ هەمتایی سەد غەم بم
زەلیلی دەستی مندالّ و ژن و ئەقوام و بێگانە
رەزیلی چاوی جیران و رەفیق و یار و هەمدەم بم
بە رۆژی سووگواری غەم دەڵێن ئەمما لە دونیایێ
لە بۆ من شادی‌یە گەر موبتەلایی رۆژی ماتەم بم
برینم بۆتە تیراوە عیلاجی ناکرێ تاکەی
هەمێشە ئینتزاری وەعدەیی دەرمان و مەرهەم بم
موقەدەر وابوو من دەو ئاخرەی عومرێ هەتا دەمرم
دەگەڵ دەرد و بەڵایان هەمدەم و ئەسراری مەحرەم بم
«ئەمین» لاتقنطو من رحمت‌اللە ، ئەمری قورئانە
خودا روحمی گەلێک زۆرە، ئەمن با عەبدێکی کەم بم

# فیراق

ئـــەی ئـــافەتی ئـــەحواڵـــی مـــن و فـــەوتی حـــەیاتم
جـــارێکی نـــەبوو قـــەت لە فـــیراقـــی تـــۆ نـــەجاتم
گەر دەمکوژی بەو خـەنجەری مـوژگان وەرە زووبـە
هــەر چـــی بـــە ســەرم دێـنی ئـەمن بـێ دەسـەڵاتم
جـــانا لە فـــــیراقـــی تـــۆ دەزانـــی کـــە چـــلۆنم
مـــەعلووم نـــیە بـــوون و عـــەدەم و ژیـــن و مـەماتم
یـــارەبی بـــە ئـــەو دەردی کـــە مـــن بـــوومە گـــرفتار
تـــۆش پـــێوە گـــرفتار بـــبی وەک مـــن بـــەهەواتـــم
ئـــــەوڕۆکـــــە دەبـــینی کـــە وەهـــا زار و زەعـــیفم
بـــــیماریی عـــــیشقێیە «ئـــەمین» بـــۆتە خـــەڵاتم

# گازندە

ئیلاهی چونکە بوویە باعیسی غەم بۆ دڵی زارم
لە دونیایێ دڵت شادان نەبێ یاری جەفاکارم
ئیلاهی چونکە داغی فرقەتت دانایە جەرگی من
بە داغی فرقەتێ تا رۆژی مەحشەر بی گرفتارم
ئیلاهی چونکە رۆژی روونی مەت کردە شەوی تار
لە دونیا رۆژی روونت بێ هەمێشە وەک شەوی تارم
ئیلاهی چون جودایت خستە مابەینێ هەتا ماوی
بە حەسرەت دیتنی وەسڵی بە گیان ببیە خەریدارم
ئیلاهی چون بەهاری عیشرەتت لێ کردمە پاییز
گوڵت پەژموردە بێ دایم میسالی رەنگی روخسارم
ئیلاهی چون دڵی شادت بە حەسرەت موبتەلا کردم
بە حەسرەت شادیی دڵ بی جگەرخەستە و بریندارم
ئیلاهی گەر لە دونیایێ «ئەمین» نەومیدی وەسڵت بوو
لە قەسری جەننەتێ ببیە ئەنیس و موونس و یارم

# موونس

ئەورۆ لە دەست هیجرانی تۆ رەنجوور و بیمارە دڵم
بەو خەنجەری موژگانی تۆ چەندە برینداره دڵم
داغی فەراقت دەم بە دەم بۆ من دەکا تەولیدی غەم
بەو دامی زولفی پێچ و خەم سەد جێ گرفتارە دڵم
ناڵەی دەروونی من مەگەر ئەی گوڵ لە تۆ ناکا ئەسەر
وەک بولبولان وەختی سەحەر دایم بە هاوارە دڵم
بۆ نەرگسی جادوویی تۆ خاڵی رەشی هیندوویی تۆ
غەیری خەیاڵی روویی تۆ بێ موونس و یارە دڵم
بێ یار و بێ موونس منم، لەو وەزع و حاڵە دوژمنم
موشتاقی رۆژی مردنم، لەم عومرە بێزارە دڵم
ئومێدی وەسڵم بوو لە تۆ، بۆ چی منت دوور کرد لە خۆ
فەرمووت «ئەمین» بۆ لەم شنۆ، هەر وەک شەوی تارە دڵم

# رەنجوور

من خەرابی دەردی عیشقی فرقەتی دیداری تۆم
دڵ کەبابی داغ و هیجری ئاهی ئاتەشباری تۆم
هەر کە مردم با بزانن جوملە عالەم خاس و عام
کوشتەیی تیری نیگاهی دیدەیی خوێنباری تۆم
بالە کێلی من بنووسن نەخشی دوو ئەبرۆت بە خوێن
تا بزانی من شەهیدی تیغی سەیقەلکاری تۆم
عاشقی روویی گوڵم، دایم دەناڵم هەر سەحەر
عەندەلیبی باغی حوسنی گوڵشەنی روخساری تۆم
گەر حەکیم نەیکوت عیلاجی عیللەتی جەرگی «ئەمین»
من دەڵێم رەنجووری عیشقی نەرگسی بیماری تۆم

# چ بکەم

بە نووری شەمعی روخسارت دڵم رۆشن نەکەم چ بکەم
لە خەندەی غونچەیی زارت دڵم گوڵشەن نەکەم چ بکەم
لە بەر شەرمی گوناهی خۆم لە مێرگ و چیمەنی دونیا
هەمێشە سەر دەبەر خۆدا وەکوو سووسەن نەکەم چ بکەم
خەیاڵی قەبری تاریکم هەمێشە هەر دە دڵدایە
لە ترسی خۆم ئەگەر تەرکی خەو و خواردن نەکەم چ بکەم
لە ئەم دونیایی فانیدا ئەگەر بۆ گەوهەری مەقسوود
دڵم وەک بەحری پڕ مەوج و سەرم گێژەن نەکەم چ بکەم
لە مەیدانی وەفاداری «ئەمین» دایم وەکوو قومری
نیشانی تەوقی عیشقی یار لە ناو گەردن نەکەم چ بکەم

# بێوەفایی

یارەکەی مە پارەکەی بەد کارەکەی عەیارەکەم
لەیلەکەی بێ مەیلەکەی بەد قەولەکەی غەددارەکەم
بێوەفای بەدعەهدەکەی بێشەرتەکەی وەعدە خیلاف
شۆخەکەی چاو کاڵەکەی قەتتاڵەکەی خوێنخوارەکەم
حیلەباز و فیتنە ساز و دڵ نەوازی عاشقان
جادوویی، خاڵ هیندوویی، مە روویی شەکەر پارەکەم
بۆچ مەگەر قەول و قەراری من دەگەڵ تۆ وانەبوو
هەر بۆ خۆت دەرمان بکەی دەردی دڵی بێچارەکەم؟
تۆ خودا ئینسافە دایم هەر وەکوو ماتەم زەدان
من گەریانم لە تاوی دەردی عیشقت پارە کەم؟
یا سەزاوارە بە ئەم ئاسایش و وەزعی زەمان
خۆم لە نێو شاری شنۆیی بێ تۆ وا ئاوارەکەم؟
پێم کوتی یاری منی یارەب لە دونیایی نەژیم
گەر لە تۆ دەست هەڵگرم یا تەرکی ئەو گوفتارەکەم
خۆ لە نێو شاری شنۆیی هەر ئەتۆ بووی یاری من
جا لە پاشی تۆ عەزیزم بۆ چی روو دەم شارە کەم
ئاه و فەریادی «ئەمین» عالەم هەموو بیستی وەلی
یارەکەی بێ رەحمەکەی من گوێی نەدا هاوارەکەم

# گوڵی یەکتا

فــەلەک ئــەورۆکــە نــازانــم،کــە چ قــەوماوە لە مــن
یارەکـەی وەعـدە خـیلافم، بـۆچی تـۆریاوە لە مـن
قاسیدی کوانی بـچی، پـێی بـڵی ئـەی دوور لە وەفـا
خــاتری نــاسکت ئـەورۆ، بـۆچی رەنـجاوە لە مـن
بە دوو خاڵی رەشی سەر، کوڵمەکەی سوور و سپیت
دڵ لە تاوی خەمی هـیجرانـی تـۆ، سـووتاوە لە مـن
خەم لە سەر خـەم، لە دڵـم بـوو بـە بـەناییکی بـڵیند
خــانەیی سـەبری دڵان پـاشی تـۆ رووخـاوە لە مـن
کەسب و کار و عەمەل و زیندەگی و وەزعی جـیهان
وەک سـەری زولفـی پـەرێشانی تـۆ شـێواوە لە مـن
رۆژی روونـــی مــە لە داغت وەکـــوو تـاریکەشەوە
شەو و رۆژ ئەی گوڵی یـەکـتا، لە بـۆگـۆڕاوە لە مـن
لە شـــنۆ، دەردی ئـــەمینی، گـــەرچـی دەرمـانی نـیە
راهــی دەرمــانی حــەکیمان، لە بـۆگـیراوە لە مـن

# پەیکی خەیاڵ

دریـــغا بـــای خـــەزان بـردی لە گـوڵشەن گـوڵعوزاری مـن
لە هـــیجران و فـــیراقـــی وی بـــووە پـــاییز بـــەهاری مـــن
دریـــــغا ئـــافتابی مـــن هـــەتا حـــەشری غـــرووبی کـــرد
نـــەما ئـــوممیدی روونـــاکـی لە بـۆ شـەبهایی تـاری مـن
دریـــغا غـــونچەیکم بـــوو بـــە تـــوفانی خـــەزان فـــەوتا
وەکـــوو بـــولبول لە هـیجرانـی نـەما سـەبر و قـەراری مـن
دریـــغا نـــووری شـــەمعی مـن نـەما تـا شـوبهی پـەروانـە
دە چار دەوری سەری سـووڕێم بکـەم جـانم نسـاری مـن
دریغا بای سـەبا روحـمی نـەکـرد هـەرگیز بـە حـاڵی مـن
بـە قـاسیدی نـەچوو رۆژێک لە بـۆ خـزمەت نـیگاری مـن
وەرە پـــەیکی خـــەیاڵ ئـــەورۆ بـچۆ تـا عـالەمی ئـەرواح
بکە شەرحی خـەمی هـیجران لە قـەولی مـن بـە یـاری مـن
بـــڵێ جـــانا بـــە مـــەرگی تـــۆ لە عـــومریش بـــێتۆ بێزارم
فـــغان و نـــاڵە و گـــریان شـــەو و رۆژ بـــوتە کـــاری مـــن
وەلی شـــێعری فـــیراقـــی بـولبولی تـەبعی «ئـەمین» ی تـۆ
لە گـــــوڵزاری شـــــنۆ بـــوویتە نـــیشان و یـــادگاری مـــن

# رۆژگار

له روویی مـەرحـەمەت جـانا دەپـرسی گـەر لە کـاری مـن
وەکـــوو زولفت پـــەرێشان و ســیاهە رۆژگــاری مــن
هــەموو رۆژیٚ لە غـەیبیٚ دا غـەمێک بـۆ مـن دەبـیٚ پـەیدا
لە دەست چــوو تــاقەت و سـەبر و تـوانـا و قـەراری مـن
بــە چــاوان هــەرچـی نـاخۆشە دەبـینم چاوەکـەم بـۆیە
کــەسیٚ نــەیدیوە تـا ئـیمڕۆ بـە خـەندە لێـو و زاری مـن
نــە دیــنم مــا نــە مـاڵم مـا نـە عـەقلم مـا نـە حـاڵم مـا
لە مــن وا بـوونەتە دوژمـن هـەموو ئـەحباب و یـاری مـن
ئەسیر و بیٚ کەس و مـەفلووک و کـەم ئـەوزاع و بـیٚ چـیزم
سوپاهی غەم لە هـەر لا گـرتوویە هـەر چـوار کـەناری مـن
گــوناهی خــۆمە ئــەو رۆژەی دەبــینم مــن لە دونــیاییٚ
خـەتای کـەس نـاگـرم چـونکە خـەتایە کـار و بـاری مـن
«ئــەمین» وەخـتی جـەوانـی چـوو عـومر نـیزیکە رابـریٚ
هەزار ئەفسووس و سەدحەسرەت بووە پـاییز بـەهاری مـن

# مووسیبەت

پــــەرتەوی ئـــــافتابە یـــا چـــێهرەیی دڵگـــوشایی تـــۆ
زوڵــمەتی لەیــلی تــارە یــا تــوڕڕەیی مێشکسایی تـۆ
بۆ رۆخی سـوبحی سـادقت دڵ وەکـوو شـەمعی هـەڵکراو
هــەر دەســووتێ هــەتا ســەحەر مـونتەزیری لەقـایی تـۆ
مـەیلی ویسـالی تـۆ لە مـن بـوو بـە فـەراقـی دەرد و خـەم
دەرد و خەمان دەکەم قەبووڵ لێم بـێ ئـەگـەر رەزایـی تـۆ
گـەردشی گـوڵشەنی بـەهار بـۆ مـنە حـەپس و چـاهی تـار
بێ تۆ نەژیم ئـەمن چ جـار ئـەی دڵ و جـان فـیدایـی تـۆ
گـــەرچـــی تـــۆ مـاە تـەلعەتی، گـوڵروخ و سـەرو قـامەتی
یا وەکوو حـۆری جـەننەتی، چ بکـەم کـە بـێ وەفـایی تـۆ
عـــیشقی «ئـــەمین» مـــوسیبەتە، فـیکر مـەکـە کـە راحـەتە
بـــۆتە ئـــەسیری دەرد و خـــەم، عـــاشقی مـــوبتەلایی تـــۆ

# شەوقی جەماڵ

ئــەگــەر بــەختم بکـا یـاری، کـە ڕۆژێک بـێمە مـاڵی تـۆ
بە چـاوی خـۆم تـەماشا کـەم، هـەمان مـاهی جـەماڵی تـۆ
حـەیاتی زیـندەگـانی، عـومری تـازە، بـۆم دەبـێ حـاسڵ
وەکـــوو خـــزری بـنۆشم مـن، ئـەگـەر ئـاوی زولاڵـی تـۆ
دەڵێن جێژنی موبارەک دێ، هـەموو عـالەم کـەیف خـۆشن
لە بـــۆ مـــن جـێژنە ئـەو ڕۆژە، کـە پـەیدا بـێ هـیلالی تـۆ
ئــەگــەر چـــی فـایدەی نـادا، لە عـیشقی تـۆ وەهـا بـمرم
وەلی چ بکـــەم مـەحو نـابێ، لە دڵ یـەک دەم خـەیاڵی تـۆ
غـــەریقی بـــەحری فـیکرانـم، جـنوونی دەشت و کـێوانـم
دەر ئاخر عومری خـۆم ڕوونـە، فـیراقـی مـاە و سـاڵی تـۆ
تۆ شـەمعی مـەجلیس ئـەفرووزی، مـنی بـێچارە پـەروانـە
دە ئــاخر خـــۆم دەسـووتێنم، لە بـۆ بـەهری ویسـاڵی تـۆ
«ئـەمین» ئـەوڕۆ ئـەمینی تـۆیە ئـەی شـەمعی جـیهان ئـارا
کە مەعلووم بوو لەوی، دوێنێ شەوێ شەوقی جـەماڵی تـۆ

# بێ وەفایی

وەعدەیی وەسڵت بە من دا کارێکی بێ‌جا نەبوو
بۆ وەپاشت خست عەزیزم، خۆ قەرارن وانەبوو
تۆ دەزانی خولفی وەعدە، کارێکی زۆر بیدعەتە
خولفی وەعدەت بۆ چی کرد کارەکی وا چانەبوو
عیشق دەردێکی عەیانە زەحمەتە بیکەی نەهان
عاشقی بەدزیم نەدیوە ئاخری ریسوا نەبوو
گەر بە ماچێکی لە کوڵمەی ناسکت کردوومە شاد
موڵکی دونیایێ نەرووخا، یا قیامەت رانەبوو
شادومانی وەسڵی تۆیە گەر شەو و رۆژێ رەقیب
بۆ دڵی غەم دیدەیی من رۆژێکی قەت شاد نەبوو
گەر دەڵێن مەجنوون زەبوونی عیشقی لەیلێ بوو وەلی
وەک «ئەمینی ئوشنەوی» بە ئاه و واوەیلا نەبوو

# چارەنووس

رزق و رۆزی کـەم عـەزیزم سـەرنویشتی قـودرەتە
گەرچی سەعیی لازمـە، ئـەمما بـە سـەعیێ نـودرەتە
سەد هەزارم دیـتووە سـەعیێ دەکـەن کـاریێ دەکـەن
کـەسبی وان ئـاخر دەبـێتە داغ و دەرد و حـەسرەتە
گەر خودا بەختی کەسێکی رەش بکـا رۆژی ئـەزەل
شەوق و شادی مـاتەمە، عـەیش و نشـاتی مـێحنەتە
ئەمری قـورئانە ( تـعزّو ) هـەم ( تـذل مـن یشـاء )
ئـەو لە بـۆ دونـیا و قـیامەت، نـوکتەیێکی حـیکمەتە
زۆر هـەنە بـوونە بـە زۆری سـەعیی خـۆ ئـومێدوار
دڵ لە ئـایاتی تـەوەککـول، خـاڵی و پـڕ غـەفڵەتە
حاسڵی دونـیا و قـیامەت بـۆتە نـاخۆشی و عـەزاب
سەعی و زۆری وان لە بۆیان بوویتە رەنج و زەحمەتە
گەر خودا مەیلی هەبێ، هەر کەس تـەرەققی پـێ بـدا
بـۆ جـیهان و ئـاخرەت، دەیکـاتە سـاحێب عـیزەتە
یـا ئـیلاهەلعالەمین، بـۆ خـاتری پـێغەمبەری
تۆ بە حاڵی من «ئەمینی ئـوشنەوی» کـەی رەحـمەتە

# دەردی هیجران

تـــەبیبانی جـیهان بـابێن، کـە دەردی مـن گـرانـباره
بـــەتیری غــەمزەیی جــانان، دڵ و جــەرگم بــریندارە
بـە زاهـیر تـالیعی خـۆم دیـوە، دەمـرم بـێ ویـسالی تـۆ
هـەتا مـاوم بکـە تـەدبیری کـارم، جـا هـەر ئـەو چـارە
غەریقی بەحرێکی خەم بووم، نەهەنگێکی بەڵام تووش بوو
وەرن ئیجماع لە بۆ سـەر مـن، گـەلی خـزمان بکـەن چـارە
بـە ئـەفلاتوون و لوقـمانێ، عـیلاجی دەردی مـن نـایێ
خەمی من با خەمی غـەیری، وەکـوو مـیسقاڵ و خـەروارە
نـیگاری مـن، جـەماڵی مـن، بکـە روحـمێ بـە حـاڵی مـن
ئـەمین لەو دەردی هـیجرانت، هـەمێشە کـاری دژوارە

# گەردەن کەجی

گەردنکەشی بێ مەعنی و بەر، داری چنارە
بۆیە هەموو کەس دەیبڕێ، چون بێ بەر و بارە

بڕوانە ئەگەر داری بەری حاسلی زۆر بێ
گەردنکەجە، پڕ مەنفەعەتە، ئەستۆیی خوارە

گەردنکەجی دارێکە، سەر ئەفرازی بەرێتی
مەعلوومە بڕۆ جێگە لە سەر چاوی خومارە

سەججادە لە ئەفکەندەیی چەند ساحێبی قەدرە
جێ سوجدەیی شاهان و وەزیرانی کوبارە

بەیداخی بڵیندگەردنە، مەغروورە لە سەحرا
سەر دەستی غولامانی لە نێو تۆز و غوبارە

پەردە لە سەر ئەفکەندەگی پێش دەرکی مەکانە
مەحرەم لە سەراپەردەیی هەر شام و نەهارە

بێ روتبەیە کاکۆڵ لە بڵیندی سەری ئەمما
زولفی کەجە جێگای کە لە سەر روویی نیگارە

شەیتان لە غرووری و تەکەببور بوو بە شەیتان
بۆیە تا ئەبەد مەسکەنی وی ئاور و نارە

گەردنکەجی مەقبوولە لە دونیا و قیامەت
دوژمن دەگەڵی دۆستە هەموو عالەمی یارە

یارەب لە شنۆیە بە ئەمینی تۆ کەرەم کەی
ئەو نێعمەتی واگەورە کە عەبدێکی هەژارە

# شەوقی ڕۆخی یار

ئــەی مــانگی چــاردە مــەیە دەر، یــارم دیــارە
تۆ چاردەهی، یارم هەموو شەو، هەر دەو چارە
سەرشازدە هەمیٚ شەوقی تۆ شەوشەو لەکەمی دا
یاری مە لە پاش شازدەهەمیٚ حـوسنی دیـارە
قەوسی قەزەحم دیت و هەناسەم لە دڵی هـات
پیٚم وابووکە ئەو قەوس و قەزەح، ئەبرووی یارە
ئەی غونچە وەرە، غـونچە دەهـانی مـە ببینە
ئەو وەختیٚ لە حـەسرەت گـریبانت بکـە پـارە
ئاهوویی خوتەن کوانیٚ دەڵیٚن: چاوی جوانـە؟
یاری منە وا، چاوی ڕەش و مەست و خومارە
تــاووسی بــەهارە بــە پــەڕ و بـاڵی دەنـازیٚ
نازانیٚ کـە یـاری مـە عـەجەب پـڕ لە نـیگارە
ئــاویٚنە، دەبـا خـوٚی دە ڕوخـی یـارم ببینیٚ
مەعلووم دەبیٚ ئەو وەختە کـە کـیٚهانە بـەکـارە
ئەی بولبول ئەتۆ عاشقی ڕوویی گوڵی سووری
مــن عــاشقی ڕوویــی گــوڵیٚکـم لالە عـوزارە
زولفـەینی سیە تـاب دەدا لە مـل و لە شـانی
ئــاویٚزە لە سـەر سـینە دەکـا وریشـە هـەنارە
بــیماری غــەمی عــیشقم و نــازانـی تـەبیبا
دەرمانی «ئەمین» ماچی دوو لەعلی لەبی یـارە

# تالع

ڕوومەتت ئاڵ و سپی، خاڵی لەب و زولفت ڕەشە
لێوەکەت یاقووتی سوورە، چاوی مەخموورت گەشە
تاقی ئەبرۆت مەیلی خوارە، هەر وەکوو قەوسی کەمان
تیری موژگانت دیارە، سەف زەدەی نیو تەرکەشە
گەردنی ساف و بلوورت، شووشە وا ڕەوشەن نیە
چاو بە دوور بێ هەر وەکوو ئاوێنە بێ غەل و غەشە
سینەیی کافوورەکەت وەک بەفری کوێستانە سپی
بۆ دڵت وەک بەختی من، نیسبەت بە من هێندە ڕەشە
لەو جەمالی وا بپۆشم چاکە چاوی خۆم وەلی
نەفسی من وەک تەبعی تۆ ئەخلاقی توند و سەرکەشە
پەرتەوی ڕووت بۆ هەموو کەس، وەک چراغی شوعلەوەر
تالعی نەحسی «ئەمین» ، لەو ڕەوشەنایی بێبەشە

# تەرسا

مــن فــدایــی چــاوەکــانت، هــێندە گــریانم مــەکــە
تــۆ بــە عــیشقی زوڵفــەکــانت، دڵ پــەرێشانم مــەکــە
تــیری مــوژگانت کــەوا دانــاوە نــێو ئــەبرۆی کــەمان
بــەم خــەدەنگ و بــەم کــەمانە، تــیرەبارانــم مــەکــە
گەر وەکوو تەرسا دەکەی تالآنی عەقڵ و هۆشی مـن
تالیبی زیـنناره هـەر وەک، شـێخی سـەنعانم مـەکـە
دڵ لە دەوری روویی شەمعت، شەو وەکوو پەروانەیە
ئەی چراغی عـاشقان، وا قـەسدی سـووتانم مـەکـە
زەحمەتە دەردی جودایی، جارێکی رەحمت هـەبی
وا دوچاری داخی دووری، دەردی هیجرانـم مـەکـە
خۆ لە عیشقی زولفی یار و چاهی غەبغەب ئەی ئەمین
بێ قسوورم، مـوستەحەقی بـەند و زیـندانـم مـەکـە

# وەسڵی یار

پەردەیی گیسووت لە سەر ئاوێنەیی رووت حایلە
یانە خورشیدی جیهان بۆ زوڵمەتی شەو مایلە
خەنجەری موژگانی چاوت قەسدی خوێنڕێژی دەکا
بۆچی من سووچم چیە، هێندە بە قەتڵم قایلە
من گەدایی دەرکی تۆمە، موستەحەقم بۆ زەکات
جارێکی گەر لێم بپرسی چی دەوێ ئەو سائیلە
دوێنێ نەبزی دەستمی گرت و حەکیمێ پێی کوتم
دەردی عیشقێیە عیلاجی ناکرێ زۆر هایلە
مردنم لەو زیندەگانی وا گەلێک پێ خۆشترە
چونکە ئەورۆکە دەزانم یار بە مەرگم قاتڵە
عاشق و سەرگەشتە و دێوانە و سەوداسەرم
هەر کەسێ وابێ لە عیشقێ پێم وەیە زۆر عاقڵە
گەر هەتا ماوی خەیاڵی وەسڵی یارت بێ «ئەمین»
هەرگیز ئوممێدت نەبێ، ئەو فکرەکی زۆر زایڵە

# داخی دەرد

حـــەسرەتم یـــارە هـــەمێشە داغ و دەردم هـــەمدەمە
کەسب و کاری من دیارە دوور لە رووی تۆ هەر غەمە
رەونـــەقی بـــاغی بـــەهارم لێ بـــووە فـــەسڵی خـــەزان
شـــادومانی وەســـڵی یـــارم بـــوو بـــە هـــیجر و مـــاتەمە
مەوجی پڕ سیلابی خوێنە یانە ئـەشکی چـاوی مـن
دووکـــەڵی ئـــاهی دەروونـــە یـــانە شـــوعلەی ســـینەمە
داخـــی نـــاسۆری دڵـــم هـــەرگیز عـــیلاجی نـــاکـرێ
ئەی فەلەک دەرحەقی من بۆچی وەها روحمت کەمە
چـــەند پـــەرێشانە دڵـــی مـــن ســـاعەتێک نـــاپشکوێ
چونکە ئەوزاعی جیهان ئەوڕۆکـە دەرهـەم بـەرهەمە
زاغ لە بـــاغاندا لە جـــێگای بـــولبولان دانـــیشتووە
خار لە باتی گـوڵ دەکـاتن نـاز و عـیشوە ئـەو دەمـە
زیرەکی ئیمڕۆ «ئەمین» لەم عـەسرە دا نـایێ بـەکـار
هـەرچـی بـێ پـووڵە لە دونـیا ئـەو رەزیـلی عـالەمە

# دیدەیی گریان

له تاوی ئاتەشی دووری، شەو و رۆژ سینه بریانه
له دووری و داخی مەهجووری، هەمێشه دیده گریانه
ئەتۆ وا تێمەگە شادم، بە ئومێدی ویسالی تۆ
قەسەم بەو تاری گیسوویەت، دڵم دایم پەرێشانه
خەیالی خۆت بنێرە، تا ببێته شادی بۆ حالم
تەماشاکە ببینە، عاشقی تۆ جسمی بێ جانه
چراغی روویی خۆت، توخوا شەوێک بۆ عاشقان هەڵکه
که وەک پەروانە مەقسوودم، له دەوری شەمعێ سووتانه
مەگەر عەهدت نەدابوو، شادومانی وەسڵی خۆتم کەی
دەنا روحمێ بکه جارێ، له سەر ئەو عەهدی جارانە
بەهارە، سەیری گوڵزارێ دەکا هەر کەس دەگەڵ یاری
له بۆ من گەردشی باغان، بە بێ تۆ حەپس و زیندانە
دەزانی ئەی گوڵی یەکتا، له هیجران و فەراقی تۆ
ئەمینی ئوشنەوی، دایم وەکوو بولبول بە ئەفغانه

# رۆخی یار

ئەو بەهارە داخ و حەسرەت وا لە من پەیدا بووە
قەلبی مەحزوونم، رەفیقی بولبولی شەیدا بووە
قامەتی شەنگ و قەشەنگی یار لە پێش چاوم ونە
بۆیە ئەورۆکە لە من، رۆژی قیامەت رابووە
قاعیدەی وایە بەهاران گوڵ لە خاکێ بێتە دەر
گوڵ دەخاکێ دا بزر بوو، قەت بەهاری وا بووە؟
عالەمێ مەجنوونی مەنعی عیشقی لەیلایێ دەکرد
بۆیە بێچارە رەفیقی وەحشی‌یی سەحرا بووە
نا بە حەق گەر عالەمێ مەنعی روخی یارم بکەن
کار و پێشەی عاشقان، هەر ئاە و واوەیلا بووە
کەوکەبی بەختی «ئەمین»ێ کەوتە نێو تاریکەشەو
ئافتابی روویی یار ئەورۆ لە من ئاوا بووە

# مەئوا

دڵ کە غەمگین بێ هەمیشە، زیندەگی دونیا چیە
چاو کە پڕ خوێن بێ بە دایم، لەززەتی بینا چیە
گوێ ئەگەر پڕ بێ لە بەحسی پڕ مەلال و جانگوداز
قووەیی ئیحساسی سەمعی گرتنی بێجا چیە
بۆ دڵی غەمگین و چاوی پڕ لە خوێنی خۆم ئەگەر
خاکی دونیایێ وەسەر کەم، مەنعی کاری وا چیە
ڕۆژی ڕووناکم، لە داخت لێ بووە تاریکە شەو
ئارەزووی شەمعێ لە بۆ پەروانەیێ سووتا چیە
عالەمێ وەک من مەریزی حەسرەت و دەرد و غەمن
نەفعی دەرمان و تەبیب، بۆ دەردی ناپەیدا چیە
وەختێ من مردم لەحەسرەت چوومە ژێر خاکی زەمین
گریەیی ئەقوام و خوێش و ئاه و واوەیلا چیە
دەردی بێ دەرمانی تۆ چارەی بە کەس نایە «ئەمین»
هیجرەتە ئاخر لە دونیا، مەنزڵ و مەئوا چیە

# عاشقی مسکین

بەرگی گوڵ وەک روومەتی تۆ، ناسک و رەنگین نیە
نەیشەکەر وەک قامەتی تۆ، راستی وا شیرین نیە
چ بکەمێ ئەی نووری هەر دوو دیدە و ئارامی گیان
دڵ لە هیچ جێگا بە بێ تۆ، ساعەتێک دابین نیە
گەر شنۆ جێگای خەمانە بۆ هەموو عالەم، وەلی
کەس وەکوو من لەو وڵاتە، عاجیز و غەمگین نیە
دەردەدار و بێقەرارم، نائومێدی وەسڵی تۆ
کار و پیشەم، غەیری ئاه و گریە و ناڵێن نیە
بولبولی شوریدە و شەیدامە دایم بێ‌قەرار
غەیری وەسڵت ئەی گوڵی من، دڵ بە هیچ تەسکین نیە
گەر زەکاتی ماچی سەر لێوت، بە موحتاجان دەدەی
کەس لە عالەم وەک ئەمینێ، عاشقی مسکین نیە

# تەقدیر

نــەوبەهارم بــۆتە پــاییز، ڕۆژی ڕوونــم تــاری‌یە
بۆ دڵی مــەحزوون و عــاجز، کــار و پــیشەم زاری‌یــە
مــردنم لەم زیــندەگــانی وا گــەلێک پــێ خــۆشترە
گەر بژیم نەمرم لەوەی پاش عومرێکی بــێ عــاری‌یە
دەردەدار و بـــێ قـــەرارم ئـــیختیارم پـــێ نـــەما
تا بە کـەی یـاڕەب بکـێشم ئـەو زەلیـلی و خـاری‌یە
قەت بە مەقسوودی دڵی خۆم ڕۆژێکی نـایل نـەبووم
ئەی فەلەک تاکەی لەگەڵ من هێندە کەچ ڕەفـتاری‌یە
نەفسی حیز ئەوڕۆ وەرە مەردانە هـەر خـۆت ڕاگـرە
قەت مەکە بێ ئەمری حەق و مـەوقیعی دیـنداری‌یـە
غـەیری تـەسلیم و ڕەزا چـارەی نـیە عـەبدی فـەقیر
ئەی «ئەمین» سەبرێ بکـە تـەقدیری حـەیی بـاری‌یە

# بەڵێن

نـــووری روخـــی پـــاکت کـــە لە دوور دا دەنـــوێنی
سـەد قـەلب و دڵـی عـاشقی وەک مـن دەسـووتێنی
گـــەر غـــونچەیی نـــەشکوفتە بـــڕوانـــێتە دەهـــانت
وەڵـــــــلاهی گـــــریبانی لە تـــــاوان دەدڕێـــنی
شـمشیری بـرۆت زولفـی کـەمەندت گـەلێ چـاکـن
جووت خـەنجەری مـوژگانە کـە خـوێنم دەڕژێـنی
سـەنعانی سـفەت وەخـتە کـە زیـنناریَ ببەستم
قـــوربان تـــۆ لە بـــەر چـــی دڵ و دیـــنم دەســـتێنی
جـــارێکی بـــڵێ بـــمرە هـــەتا ســـەر بـە فـیدا کـەم
هەر رۆژێ دووسـەد جـار لە غـەمی خـۆم دەمـرێنی
شـــەرت بـــێ کـە هـەتا مـاوە ئـەمین بـێ تـۆ بـناڵێ
دوور بـــێ لە ویســـالت ئـــەگـەر عـەهدی بشکـێنی

# نزا

ئەگەر مەیلت لە دڵ دەرکەم، دڵم دایم بە ناڵێن بێ
ئەگەر جانا لە یادم چی، تەنم مەجرووحی زووبین بێ
سەرو رووی یارێکی دی،چاو سەوای تۆگەر تەماشاکا
ئیلاهی کەسب و کاری وان، رژانی ئەشکی خوێنین بێ
ئەگەر عاشق بە بێ فکرت، شەوێک خەو بێتە چاوانی
لە باتی باڵشی پەڕ، خاکی قەبری لێی بە باڵین بێ
لە عیشقی روویی لەیلایێ، وەکوو مەجنوونی دێوانە
مەکانم هەر لە کێوانە، چ زستان و چ هاوین بێ
بە گوفتارت قەسەم، بێ تۆ ئەگەر شەربەت بنۆشم من
دەزارم دا وەکوو زەهرە، ئەگەر قەنداوی شیرین بێ
«ئەمین» جانا لە پاشی تۆ، ئەگەر یارێکی دی بگرێ
هەتا دەمری سەزاواری هەزاران تووک و نفرین بێ

## تەخمیسی ئەمین شنۆیی لە سەر شێعری قازی محەممەد خزری

مـــوستەغنی‌یە جـــانا لە ســەد مــەدح و ســەنادا
خـــورشید لە بـــورجـی حـەمەلێ شـەوقی وی نـادا
ئـیمڕۆ کــە دەبــەحری غـەمی دڵ بـووم دەشـەنادا
حــوسنی روخـــی یـــارم بە نـەزەرکەوت لە پـەنادا
عـــەقڵ و دڵ و دیـــنم بـە دەمـــی بـــادی فـەنا دا

عـەتری گـوڵی روخســاری دەهـات فـەسڵی بـەیانی
بەم عـەترە دەبـوو مـەست و جـنوون عـاشقی فـانی
وەک دڵـبەری جـانانەیی خـــۆم دی بـــە عـــەیانی
فکـــرم وەبـــوو خـــۆم لادەم و دوور بـــم لە کـەمانی
لەو قـــەوسی بـرۆی تـیری مـوژەی دەرچـی مـەبادا

نـــەمزانـــی بکـــەم شـیکوەیی دەردی دڵـی زارە
دەرمـــانێ بـــخوازم لە بــۆ ئـەو قـەلبی بـیمارە
لاڵ بـــووم و زبـــانم نـەگـەڕا ئـەمنی بـێچارە
زانـــی کـــە خـــەیاڵم هـــەیە هـــات و بـــە ئـیشارە
فـــەرمووی دەمـــی وەســڵە لەگـەڵ ئـەربابی وەفـادا

هەر چەند لە پێش چاوی تۆ شیرین وەکوو قەندم
مەحبووب و پەری پەیکەر و مەهپارە و رەندم
سەد هێندە بە ئەفسوون و بە دوولاب و بە فەندم
هەیهات کە دەرچی بە سەلامەت لە کەمەندم
چاک وایە نەدەی عومری عەزیزت بە فەنادا

پەروانە دەگەڵ شەمعی روخت کەی دەبێتن جووت
هێشتاکە تەواو وەسڵی نەبوو باڵ و پەڕی سۆت
وەڵڵاهی کە سووتاوە لە دونیایێ «ئەمین» بۆت
نەرزیوەیی چۆن واڵەیی وەسڵە بە سەری خۆت
ئینساف بکە با سەعیی نەچێتن بە هەوادا

# دڵی غافڵ

ئـــەی دڵــی نـــاهۆشیار و غـــافڵ و مـــەست و غـــورروور
ئـــەی لە عـــوسیانی قـەریب و وەی لە ئـیحسانی بـە دوور
فکـــرەکـــی نـــاکـــەی لە حـاڵی خـوفتەگـانی نـێو قـبوور
مـــەنزڵی وا پـــڕ لە خـــۆف و مـەسکەنی وا تـەنگ و قـوور
خاک بە سەر، هەر خۆت بە خێو کە بۆ تەعامی مار و موور

وا بـە عـینوانـی و تـەکـەبور بـۆ لە سـەر خـاکـی دەڕۆی
ئەسڵی تۆ ئاخر لە خـاکـە، دەبـیەوە خـاک ئـەسڵی خـۆی
پـێم وەیـە بـیللا لە دونـیا بـێ شـعوورێک بـێ، ئـەتۆی
بۆچی ناکەی سەعیی ئاخیر، تا بە دووڕووی ڕەش نەڕۆی
بـەڵکوو ڕوحـمێکی بکـا پـێت خـالقی حـەیی غـەفوور

شـــەو هـــەتا ڕۆژی تـــۆ زاڵـــم هـــەر لە خـوابـی غـەفڵەتی
ڕۆژی تـــا شـــەو دەرپـــەیی لەززاتـــی نـەفس و شـەهوەتی
وەک شەراب خۆران بـە دایـم مـەست و گـێژ و عـیشرەتی
بـــا وجـــوودی وەش، لە دونـیا هـەر بـە داخ و حـەسرەتی
قـــەت تـــەواو نـــابێ مـــەرامت ئـەی تـەمەعکاری غـیوور

عـــــومری وا فـــــانی، دەزانــــــی ئـــــیعتباری بـــــۆ نـــــییە
ڕۆژی مـــــەرگی تـــــۆ، پـــــەیامی ڕۆژگـــــاری فـــــانییە

هەر وەکوو گوێت لێ دەبێ، ئەورۆ فلاٚن کەس مردییە
تۆکە وا ئاخر دەزانی، شادومانیت بۆ چییە
هەر بگریە، هەر بناڵە، هەر بسووتێ وەک تەنوور

خاک بە سەر عەقڵی نەفامت، ئەی «ئەمین»ی ماڵ خراب
بەو هەموو باری گوناهان، دوور لە ئەفعالی سەواب
ناگری بیللاهی تاب و تاقەتی ڕۆژێک عەزاب
لەو بیابانی قیامەت، ڕۆژی میزان و حیساب
جا زوبانت چۆن نەگیری، وەختێ دەتهێننە حزوور

# نەفسی زاڵم

ئاخ لە دەستی زوڵمی نـەفس و ئـەو جـیهانەی حـیلەگـەر
ئــەی سـەلاّ لە مـنی غـەریب و مـاڵوێران و قـوڕ بـە سـەر
عــومرێکم رابــرد بــە پـووچی، غـەفڵەتم لێ بـوو سـپەر
قەت دەحـالیٚ خـۆ نـەفکریم، چـیم لە بـۆ نـەفحە و زەرەر
نــامەیی ئــەعمالی خــۆم پـڕ کـرد لە عـوسیان و لە شـەڕ

دایک و بــابم مــرد و دیـتم چـوونە قـەبری تـەنگ و تـار
دۆست و ئــەحبابم هــەموو کـردیان لە دونـیا کـۆچ و بـار
مــن لە نــاو خــزم و رەفـیقان، مـامەوە بـێ دۆست و یـار
مــــوزنیب و زار و زەلیــــل و رووســــیاە و شــەرمەسار
مــونتەزیر مــاوم، ئــەمیش داخـۆ دەکـەم کـەنگی سـەفەر

تـاکـوو مـاوی ئـەی بـرادەر، دڵ بـە دونـیا خـۆش مـەکـە
هــەرچــی نـەفسی تـۆ بڵێ، بـۆ تـۆ زیـانە گـوێش مـەکـە
عەقڵێکی بینە، وەبەرخۆ، هـێندە خـۆت بـێ هـۆش مـەکـە
بادەیی عیشقی جـیهان گـەر شـەربەتیش بـێ نـۆش مـەکـە
ئــاخری زەهــرە، پــەشیمان دەبــیەوە ئــەی بـێ خـەبەر

هــەر لەویٚ رۆژەی کــە مــن خــوڵقام لەویٚ دونــیایی دوون
دایمه هەر دڵ به غەم بــووم، نــەمدی قــەت رۆژێکــی روون
چـــونکه دونـــیا هــەر غــەمه، ئــاخر هــەبوون و یــا نــەبوون
گـــەر دڵت شـــادکا ده ئـــەوەڵ، ئـاخریش دەتکـا زەبــوون
تیٚ بـفکره، ئـەو جـیهانه بـۆ کـەسیٚ قـەت چـوویته سـەر؟

شـــــەو هـــــەتا رۆژیٚ بــناڵە هـــەر له دەرگـــاهی خـــودا
بـــەڵکه ئـــیمانت نـــەکـا لیٚ وەخـــتی روح کـێشان جـودا
هەم ده قەبری تـەنگ و تـاریک، روحـمی خـۆتت پـیٚ بـبا
گـــەر بـــه لوتـــفی هـەق ئـەمین ئـاسان جـوابـی خـۆ دەدا
تـــــا قـــیامەت هـــەر دەکـــا شـــوکری عـــەتایی دادگـــەر

# تەبیبی عیشق

بە تیری قەوسی ئەبرووی تۆ کە ئەورۆ زۆر بریندارم
بە چاوی مەستی جادووی تۆ گەلێک ڕەنجوور و بیمارم
بە قەیدی دامی گیسووی تۆ وەکوو مەجنوون گرفتارم
تەبیبانی جیهان با بێن بکەن چارەی دڵی زارم
بە کەس نایێ شەفای دەردم،مەگەر بەو شۆخی دڵدارم

وەکوو بولبول لە عیشقی گوڵ مەکانم گۆشەیی باغە
لە باتی بولبولان چ بکەم لە گوڵشەن دێ سەدای زاغە
دەروونم لەتلەتە جیسمم ئەگەرچی زاهیری ساغە
بە خاڵانت قەسەم جەرگم سەراسەر نوقتەیی داغە
لە تاوی دەردی خۆمە شەو هەتاکوو ڕۆژێ بێدارم

وەکوو بادی سەبا بۆنی گوڵی یارم لە بۆ دێنێ
لە لای من تاقەت و سەبر و قەرار و هۆشێ نامێنێ
سەدایی قومری و بولبول دڵ و جەرگم دەسووتێنێ
ئەگەر وەقتی سەحەر بولبول لە عیشقی گوڵ دەناڵێنێ
منی بێچارە، ڕۆژ و شەو لە عیشقی تۆ بە هاوارم

له عـــیشقی روویـی لەیـلایێ وەکـوو مـەجنوونی دێـوانـە
مـــەکـــانم هـــەر لە کـــێوانـــە، لە عـــالەم بـــوومە بـــێگانە
دڵـــم بـــەو فـــیکر و ئـەندووهی تـۆ بـۆتە مـەسکەن ولانـە
لە وەسفی روویی شەمعێ دا دەسـووتێ گـەرچـی پـەروانـە
ئـــەمن دایـــم دەســـووتێم و لە عـــومریش بـــێ تـۆ بـێزارم

لە عیشقێ دوو بەڵام تووش بوون، پەرێشانیی و سەوداسەر
تـــەبیبی دەردی عـیشقی مـن ئـەتۆی ئـەی نـازەنین دڵبەر
لە نـــێو شـــاری شـنۆیێ بـێ ئـەنیس و مـوونس و رەهـبەر
نەخۆشی دەردی هیجرانە «ئەمین» ی بێ کـەس و بـێ دەر
حـــەکـــیم دەرمـــانی نـــازانـــێ،وەرە یـــاری وەفـــادارم

# شەیدایی گوڵ

ئێمڕۆکە لە هیجرانی تۆ بیمارە دڵی من
شێواو و پەرێشان و برینداره دڵی من
دائیم وەکوو نەی، حەسڵەتی هاواره دڵی من
موشتاقی مولاقاتی ڕۆخی یاره دڵی من
وەڵڵاهی بە عیشقی تۆ گرفتاره دڵی من

شەو تا بە سەحەر موونسی دڵ، فیکر و خەیاڵە
گاهێ غەمی هیجرانە، گەهێ زەوقی ویساله
من موشتەریی ڕوویی تۆ ئەی ماهی جەماڵە
سەییادی مەل و عاشقی دوو چاوی خەزاڵە
بەو یوسفی کەنعانی، خەریداره دڵی من

واتێ مەگە گەر هەیکەلی من، زاهیری ساغە
وەک لالە دەروونم هەموو لەو هیجری تۆ داغە
پەروانەسفەت، مەقسەدی من ڕوویی چراغە
وەک بولبولێ هەر حەسرەتی من دیتنی باغە
شەیدایی گوڵ و تالیبی دیداره دڵی من

هەر شەو لە فیراقی روخت ئەی شەمعی یەگانە
سەیلابی سروشکم لەو دوو چاوانە رەوانە
بەو تیری غەمت قەلبی حەزین بۆتە نیشانە
ئەو دڵبەرە تەرسایە لە عیشقی خۆ بزانە
سەنعانی سفەت تالیبی زیننارە دڵی من

گیانە وەرە روحمێ بکە بەو ئەمنی حەزینە
جەرگم لە فیراقی تۆ هەمووی کۆنە برینە
لێوت بە مەسەل شەکرە وە یا قەندی شیرینە
ئەو مەڵحەمە بۆ دەرد و دەوای گیانی ئەمینە
موشتاقی روخی دڵبەرە دوو بارە دڵی من

# پەرتەوی عیشق

سەودای سەرم عیشقی روخی لالە عوزارە
تەسکینی دڵم غەمزەیی دوو چاوی خومارە
خوێناوی جگەر فیرقەتی هیجرانی نیگارە
سینەم وەکوو تەندووریٚ پڕ ئەز شوعلەیی نارە
جەرگم وەکوو نەی کونکونی سەدزەخم وفیگارە

ئەو دڵبەری نازوک بەدەنی دڵ وەکوو بەردم
روحمی نیە بەو ناڵەیی گەرم و دەمی سەردم
زۆر زار و زەعیفە و لەبی ئیشک و روخی زەردم
لوقمانی حەکیم کوانیٚ بکا چارەیی دەردم
وەسڵە کە دەکا دەردی دڵی عاشقی چارە

ئایا تۆ پەری یانە لە نەسلی بەشەری تۆ
حۆری مەلەکی پەرتەوی شەمس و قەمەری تۆ
من بۆ تۆ وەها شیفتە و بیٚ خەبەری تۆ
ئارامی دڵ و هۆشی سەرم چوو بە سەری تۆ
دێوانەسفەت کەوتمە نێو کێوی موغارە

تەقدیری ئەزەل وابوو لە رووی تۆ کە جودابم
پەروانەیی حەسرەتکەشی دیداری چرابم
بەو یەک نەزەرە سووختەیی ناری فەنابم
بنوێنە شەوی شەمعی روخت من بە فیدا بم
گەردانی سەرت بم لە هەموو دەور و کەنارە

ئەی گوڵ تۆ دەزانی چیە نەغمەی تەڕەب ئەفزا
خورشید لە بۆ شەب پەرەیی دڵ نیە پەیدا
نەفعی چیە ئاوێنە لە بۆ دیدەیی ئەعما
تا پەرتەوی عیشقی لە دڵی خەڵکی نەکا جیا
ئەشعاری «ئەمین» ی لە شنۆ بێ خەریدارە

# نووری بەسەر

روخساری مەهت، قەتحەیی تەسویری فەرەنگە
گیسووت وەکوو ماری سیاه مایلی جەنگە
شیرین و بەدەن نەرمی، دڵت رەق وەکوو سەنگە
سوبحانە لە بەر ئەم قەد و باڵات چ شەنگە
دەنوێنێ چو تاووس، بە هەر ساعەتێ رەنگە

فەوارەیی خوونابی سروشکم لە دوو چاوان
دەیدا خەبەری سۆزی دڵ و جەرگ و هەناوان
بازی دڵەکەم ماهیرە هەر وەختێ لە راوان
کێ فکری دەکرد وا زوو بگیرێ بە دوو داوان
ویستاکە گرفتارە بە دامی سیە زەنگە

ئەی نووری بەسەر رەوشەنی رووناکی دووچاوم
دڵبەندی دەروونم، فەرەحی جەرگ و هەناوم
ماتەم زەدەیی بەحری غەم و عومری تەواوم
وەک زولفی پەرێشانی تۆ شێواو و بڵاوم
وەک نوقتەیی زاتێ دڵەکەم عاجز و تەنگە

ئەی سەرو قەدی، لالە روخی، گوڵشەنی شادی
خورشید سەما، حۆری لەقا، ماە نژادی
پاکە بەدەنت، پاکی بە خۆت، پاک نەهادی
چاوت وەکوو سادێیە، لە سادی تۆ زیادی
تووتی و زەغەن هەم قەفەسن پێکەوە نەنگە

عیشقی تۆ سەعیدان کە دەکاتن شەقی ئەی گوڵ
هەم سۆفیی سەد ساڵە دەکا فاسق و بێ دڵ
دەشکێنێ گەلەک تۆبە ئەگەر زاهیدی کامل
حەقیانە کە چ بکەن تۆ بە زولفەینی چو سونبول
زوو سەید دەکەی ماهیی دەریا و نەهەنگە

بێچارە «ئەمین» بۆ چی وەها هێندە دەناڵی
تاکەی بە ئومێدی هەوەسی زەوقی ویساڵی
حەیفە تۆ هەموو وەختێ لە دووی فیکر و خەیاڵی
مومکین نیە ئیدی کە ببینی تۆ جەماڵی
خامۆش بە مەناڵێنە لە کن کەس مەکە دەنگە

# ویسال

لە چێهرەی ئەرغەوانی من نیشانی عـیشقێ پـەیدایـە
بە ئەشکی خوێن نیشانی من خەتی هیجرانێ نووسرایە
حەدیسی دامی مەجنوون و سیوادی زولفـی لەیـلایە
حەقیقەت بولبولی مسکین لە بۆ گوڵ شێت و شەیدایە
کەسێ پابەندی عیشقێ بێ لە عالەم مەست و ریسوایە

بە چاوی بازی بیماری رەشی مەستی سەحەرخـیزی
کە هەڵدەستێ لە خەو یارم وەکوو شیرینی پـەرویزی
دەکا ئیحیا دڵی عالەم بە لەفـزی شـەککـەر ئـامێزی
فیدایی چاوی مەستت بم لە بۆ ئیمڕۆکـە لێـم زیـزی
گوناه و سووچی من ئاخر چیە، چ بووە، چ قـەومایە

وەفـایی ئـاسمانێ هـێندە بـوو لێکـی جـودا کـردین
بە داخ و حەسرەتی دەردی جودایی مـوبتەلا کـردین
لە عـالەم زێـدەتر گـیانا مـن و تـۆی بـەربەلا کـردین
چ شادی پێ نەما سەهلە هەمووی خەم پێ عەتا کردین
خسووسەن من دڵم دایم بە نـاری عـیشقێ سـووتایە

لە دنیا گەرچی دەستی مەتڵەبم ناگاتە دامانت
لە سەر پردی سیڕاتێ شەرتە بگرم من گەریبانت
دە ئاغووشی خۆ بگرم قامەتی سەروی خەرامانت
بە حوببی دڵ هەمێشە بۆن بکەم نارنجی پستانت
بڵێم ئەو نیعمەتە میسلی عەتایی حەق تەعالایە

نەبۆ لەیلی وەکوو من عاشقێ مەجنوونی دێوانە
نەبۆ دیداری شەمعێ مایلی سووتانە پەروانە
نە بولبول وەک ئەمینی عاشقی روویی گوڵە گیانە
لە پێش چاوم سەراسەر موڵکی دونیا بێ تۆ زیندانە
لە حەشرێدا ویسالی تۆ دەکەم لە خودای تەمەننایە

ناو بەهەشتی، بە بێ غەم و دەردە سەر. بە چاوی خۆی دەبینێ جەماڵی خودایی ئەکبەر.

ئیمامی شافعی فەرموویەتی بێ گومان. هەرکەس تەدارەک بکا لە مەولوودی سەییدی ئینس و جان. خڕ بکاتەوە جەماعەتی برادەران. موهەییا بکا خواردن و نان. موزەییەن و خاڵی بکا لە ماڵی خۆی جێ و مەکان. بێ تەقسیر بکا خزمەت و ئیحسان. ببێتە سەبەبی خوێندنی مەولوودی ساحێبی «تَلاوَةُ القُرآن». لە رۆژی قیامەتێ حەشری وی دەکرێ دەگەڵ سەدیق و شەهید و ئەولیایان. بە بێ زەحمەت و موشەققەت دەچێتە ناو باغی جنان. شاد دەبێ و بە حۆر و قوسوور و غیلمان. «صَلّوُ عَلَیهِ وَسَلّم تَسلیما».

شێخ سرری سقەتی، لێی بێ رەزایی مەعبوود. فەرموویەتی:

هەرکەسێ بە حوببی دڵ بچێتە سەر خوێندنی مەولوود. کە ئەننەهوو دەکا قەسدی رەوڵەیی جەننەت و حەوزی مەورود. چونکە دەبێتە سەبەب و حوببی ساحەبی« مقام المحموود» و«لواءالمعقود».«رئیس العلمایی» عێراقی و حیجازی. ئیمام فەحرەدینی رازی. خودا لێی ببێ رازی. فەرموویەتی:

ئەگەر بخوێندرێ مەولوودی ئەفزەلی مەخلووقات. لە چێشتێکی لە مەئکوولات. تێی دا زاهیر دەبێ بەرەکات. لە مەعدەی ئینسانی دا دەس دەکا بە ئیستراب و حەرەکات. تا بۆ ئەو کەسەی کە خواردیتیەوە مەغفیرەت دێ بە خەلاٚت. مەولوودی شاهی لەولاک. ئەگەر بخوێندرێ لە ئاوێکی پاک. هەرکەسێ بخواتەوە، دەبێتە پیاوێکی چاک. دەچێتە ناو دڵی هەزار نوور و رەحمەت. دەردەچێ لە ناو دڵی هەزار هەزار غەل و غەش و عیللەت. مەولوودی ساحێب مێعراج. ئەگەر بخوێندرێ لە دراوێکی سککە لێدراوی رەواج. دەیکەوێتێ بەرەکەت، ساحێبی قەت نابێ موحتاج.

«سلطان العارفین»، حەزرەتی شێخ جەلالەدینی سیوتی فەرموویەتی بە یەقین.

له هەر مەکانێکی بخوێندرێ مەولوودی« سیدالمرسلین». دەوری دەدەن مەلائیکەی دەنورین. هەموویان سەف دەبەستن، رادەوەستن، تەبەق تەبەق رەحمەتان به سەر ئەهلی ئەو مەکانەیدا دەرژێنن، له خەزینەی رەحمەتی «رب‌العالمین». ئەمما مەلائیکەی موقەرەب، یەعنی جوبرائیل و موکائیل و ئیسرافیل و عیزرائیل و عینائیل. سافین و حافین و کەرروبین. تەڵەبی مەغفیرەت دەکەن بۆ ئەو کەسی که بوویته باعیسی خوێندنی مەولوودی« شفیع المذنبین». له سەر وی دەفع دەکرێ بەلاّ. تاعوون و وەبا. سووتان و خنکان. شەرری ریگران و دزان. بوغزی حەسوودان. وەهمی جەمیعی ئافەتان. ئیمان له چنگ شەیتانی بێ ئیمان. خەلاس دەکا. جوابی مونکیر و نەکیران به ئاسانی دەدا. قەبری تەنگ و تاریک له بۆ وی دەبێته باغ و باغات. «صَلّوُ عَلَیهِ وَسَلّم تَسلیما».

حەکایەت کراوه له زەمانی ئەمیرەلرەشید. هاروونەرەشید. له شاری بەسرایێ جەوانێک هەبوو زۆر پەلید. له فاسقیدا شاگردی وی بوو یەزید. چ چاکەی نەبوو له پاشی ئیمان. که مانگی مەلوودی دەهات. غوسلی تۆبەی دەکرد به دلّ و گیان. تەعامێکی لێدەنا، لێی دەخوێندەوه مەولوودی پێغەمبەری ئینس و جان. که مرد له بەر خەراپییان، فرێیاندا سەر گووفەکان. نەیانبردە سەر قەبران. نەدایەک هات له ئاسمان. ئەی ئەهلی بەسره حازر ببنه سەر جەنازەی فلاّن جەوان. که یەکێکه له ئەولیایان. ئەهلی شاری جەوان و پیر. پادشا و گەدا و دەروێش و فەقیر. حازری سەرجەنازەی بوون. شاردیانەوه بێ تەئخیر. له خەویان دیت ئەوەلّ شەو لەسەر تەختی دانیشتووه ئەو. روخساری وەک مانگی چاردە شەو. پێیان گوت: ئەتوو له دونیایه زۆر فاسق بووی و ئەحمەق. به چ سەبەب شاد بووی. به حۆر و قسوور و لیباسی سندووس و ئیستەبرەق. گوتی: سەبەب به تەعزیمی مەولوودی ئەو کەسی که به ئیشارەی ئەنگوشتێ مانگی کردووه شەق.

حەکایەت کراوە لە شاری هەولێری، پادشایەک هەبوو ناوی سولتان موزەففەر بوو. یازدە مانگان هەر لە تەدارەکی مەولوودی پێغەمبەر دابوو. لە کوللی زی ڕۆحان یەک هەزاری دەکوشتەوە. چەند هەزار نەوع تەعامی دروست دەکرد. لە تەڕەف بوخارایێ دوازدە هەزار عولەمای دەهێنا، بۆ قەراعەتی مەولوود. هەمووی خەڵات دەکردن. شەوێکی لە خەودا، چاوی پێ کەوت بە جەماڵی حەزرەتی رەسوولەڵڵا (صَلَی اله عَلَیه). فەرمووی یا موزەففەر، یا«نورالعین». «اَنقَذنی مِن هذینِ الاشقَرین». لە خەو راپەڕی. سەڵەواتی دان لە پێغەمبەری. تیکرار نوستەوە. پێغەمبەری لە خەودا دیتەوە. ئەو کەلیمەی لە لێوی مبارەکی بیستەوە. دووبارەکە بە خەبەر هات. لە پێغەمبەریدا سەڵەوات. دەفعەی سێهەم کە ئەو حاڵەی دیت. وەزیرێکی عاقڵی هەبوو تەڵەبی کرد. خەونەکەی لە بۆ گێڕاوە. وەزیرەکەی گوتی: رامەوەستە، ئەڵبەتە ئیشێکی گەورە لە مەدینەی مونەوەرە قەوماوە. هەر ئەو شەوی بەئیلغای دەگەڵ خۆی برد، شێست بار درهەم و دینار. رووی کرد بۆ مەدینەی پڕ ئەنوار. لە مزگەوتی رەسوولەڵڵا دابەزی. لە بەر حیرەتان دڵ و جانی تەزی. ئەمری کرد ئەهلی شاری بێنە لام جەماعەت بە جەماعەت. بێن تا هەموویان بکەم خەڵات. هەرچی دەهات دەینووری بە قەستی. مستێکی زێڕ دەنا دەناو دەستی. گەورە و گچکەی بەو نەوعەی خەڵات کرد. رێی بۆ سەر حەدی مەقسوودێ نەبرد. لە پاشان پرسی کێ مایە؟ تا بیدەمێ سەرمایە. گوتیان کەس نەمایە. بە غەیرەز دوو زاتی مباڕەکی نوورانی. عابیدی خەڵوەتخانەی رووحانی. خادمی دەرگاهی رەببانی. فەرمووی تەڵەبیان کەن بێنە لام. بە ئیعزاز و بە ئیکراڕم. کە هاتن ئەو دوو شەخسی بەد فیعالی ئەشقەر. جێ بە جێ کەوتنە سوجدە و سەڵەوات لێدان لە دیداری پێغەمبەر. گوتی: ئێوە چین لێرە؟ گوتیان: ئێمە خادمی پێغەمبەرین. لێرە بوونمان زۆر خێرە. عیبادەت بۆ خودا دەکەین. پارە بە فەقیر و هەژار دەدەین. فەرمووی: جێتان لە کوێیە؟ گوتیان: لە حوجرەی مەسجدێیە. چۆ حوجرەیان بێ تەئخیر. دیتی رایەخسترایە یەک

حەسیر. کە حەسیریان لابرد، لە بنی تەختە دار بوو. کە تەختە داریان لا برد. نەغەمێک دیار بوو. چووە ناو نەغەمی حاکمی ئەربیل. تێی دابوو کوڵینگ و بێڵ. لێیان دەدان بە مەترەق. ئەو جار ئیقراریان کرد بە موتلەق. گوتیان: ئێمە کافرین. هاتینە وجوودی، زجوودی، مەسعوودی رەسوولەڵلا بدزین. بیبەینە مەملەکەتی فەرەنگی. بە دزی بێسووتێنن بە بێدەنگی. ئەمری کرد لە بەرابەر رەوڵەی موتەهەڕ. شەقیان کردن ئەو دوو کافری سەگی بەتفەڕ. لە ئەترافی رەوڵەی بەنی هاشمی «عَلَیه الصَلوٰةُ والسَلام». سەددێکی دارژاند لە قورقوشمی. بە بەرەکەتی مەولوودی پێغەمبەر. نائیل بوو بەو شەڕەفە.

مەرحەبا ئەی سەیدی دونیا و دین
مەرحەبا ئەی «صادق الوعد الامین»
مەرحەبا ئەی تایری عەرشی خودا
مەرحەبا ئەی شاهی جەمعی موڕسەلین
مەزهەری ئیعجازە وەک «شق القمر»
بەرگوزیدەی خالقی حەیی موعین
سەد هەزارت شاه سەر بەر ئاستان
قەیسەر و ئەسکەندەر و خاقانی چین
ئەی لە بۆ تەبلیغی ئایاتی کەلام
قاسدی راهی تۆ جوبڕیلی ئەمین
تۆ نەبی بووی یا محەممەد دەرئەزەل
حەزرەتی ئادەم لە بەینی مائوتین
ئوممەتی تۆینە، پەناهن هەر ئەتۆی
رۆژی مەحشەر یا «شفیع المذنبین»

رۆژی مەحشەر وەختی میزان و حیساب
یا محەممەد تۆ شەفیع بە بۆ «ئەمین»

حیکایەت کراوە: حاکمێک هەبوو زۆر زاڵم و غەددار. ئەمما عادەتێکی هەبوو، هەموو ساڵێ دەیکرد مەولوودی پێغەمبەری نازدار. ئامۆزایەکی هەبوو بە تەمەعی حکوومەتێ بوو. چەندی دەیکرد بە حاکمەکەی نەدەبرد زەفەر. رۆژێکی دیتی حاکمەکە لە خیلوەی دانیشتووە. بێ سەلاح و هەمدەم و هەمسەر. لە نەکاو را دەست بە حەنجەر. لینگی دایە سەر. گوتی: ئەی خەبیسی پیسی بەتفەڕ. کێ هەیە خەلاست. بکا، ئەلعان دەتکووژم بە خەنجەر.

حاکمەکە بە سەر زمانیدا هات کوتی: خەلاسم دەکا مەولوودی پێغەمبەر. هێشتا بە تەمامی قسەی لە زاری نەهاتبۆ دەر. خشتەیەک لە دیواری دەرپەڕی. وەسەری دڵی کەوت جێ بە جێ حەیاتی لە بەر بڕی.

نەدایەک هات لە ئاسمان. نەجاتماندای بۆ حورمەتی «سیدالسقلین». ئەگەر ئەتۆ زیاد بکەی، ئێمەش بۆت زیاد دەکەین.

حیکایەت کراوە: عەبدوڵڵای مبارەک دەفەرمووی: تەدارەکی حەجم دەکرد. رۆژێکی لە محەللەیەکی گوزەرم کرد. چاوم بە ژنەکی کەوت. مرداره بووەکی دە دەستی دابوو. کوتم: نازانی مرداره بوو حەرامە؟

گوتی: ئەی عەبدوڵڵا ئیستراری ئیحتیاجێ حەرامێ حەلاڵ دەکا. دە دڵی خۆمدا گوتم: ئەو مانگە، مانگی مەولوودە، وە چاکە هەموو ماڵی خۆم، بە نییەتی مەولوود بدەمە ئەو ژنە. رەفیقم هەموو چوون و هاتنەوە. لە خەودا پێیان گوتم:

ئەی عەبدوڵڵا، مادام هەموو ماڵی خۆت بە نییەتی مەولوودی پێغەمبەردا بەو ژنە. خودای تەعالا مەلایکەتێکی خەڵق کردووە بە سووڕەتی تۆ. هەموو رۆژێ حەجێکت لە بۆ دەکا هەتا رۆژی قیامەتێ.

حیکایەت کراوە: لە ئەییامی عەبدولمەلکی بنی مەروان. جەوانێک هەبوو زۆر سوار چاک بوو لەو زەمان. دایما ئەسپی خۆی غار دەدا لە مەیدان. لە شاران و لە دەشتان. رۆژێکی لە رۆژان لە نێو شاریدا ئەسپەکەی دەیکرد جەولان. چونکە سەرکێش بوو نەگەڕاوە. رووی کەوتە بەر دەرگای خەلیفەی. «تقدیرالله» کوڕی خەلیفەی لەو مەیدانی دەخولاوە. کە بازدی هاویشت ئەسپی بەتفەر. سەر و سینە و زگی تێک شکاند وەک فەنەر. کە گەیشتە خەلیفەی، ئەو خەبەرەی وەحشەت ئەسەر. دەریای غەزەبی هاتە جۆش. دەستی کرد بە جۆش و خرۆش. گوتی: قاتلی کوڕم بێنن. لە پێش چاوم بە ئاگری بیسووتێنن. جەللاد و فەراش دەرپەڕین. وەک شێری نەر دەنەڕین. دیتیان جەوانەکەی مسکین. دە دڵدا گوتی: ئەی «رَبَ العالَمین». ئەگەر خەلاسم بکەی لەم بەلای وەها عەزیم. شەرت بێ بیکەم مەولوودی پێغەمبەری کەریم و قۆڵیان گرت هێنایانە حزوور خەلیفەی. کە چاوی پێکەوت دەستی کرد بە پێکەنین. لە پاش وەی کە نێزیک بوو بخنکی لە بەر بوغز و قین. گوتی: ئەی جەوان ئەتۆ ساحری؟ گوتی: ناوەڵلا یا«امیرالمومنین». فەرمووی: ئەی جەوان ئەوە عەفوم کردی. ئەمما بڵێ بزانم چت بە سەر زمانیدا هات؟ گوتی: لەو زمانەیدا گوتم: یا رەحمان و یا رەحیم. ئەگەر خەلاسم بکەی لەو بەلای وەها عەزیم. شەرت بێ بیکەم مەولوودی پێغەمبەری کەریم.

ئەوجار خەلیفە دایە وی هەزار زێڕی سوور. تا خەرج بکا لە مەولوودی پێغەمبەری پڕ نوور.

حیکایەت کراوە: لە مەملەکەتی بەسرەی. پیاوێک هەبوو هەمووساڵ، لە بۆ مەولوودی رەسوولی مەلەکی موتەعال. خەرجی دەکرد گەلێک زێڕ و زێو و ماڵ. جیرانێکی هەبوو جوولەکەی دین بە تاڵ. ژنەکە لە مێردەکەی خۆی پرسی: چ حیکمەتە هەموو ساڵان. لەم وەختەدا ئەم جیرانەی مسوڵمان. ماڵی خۆی دەکا تاڵان. بە هیچ و پووچ و خۆڕایی سەرف دەکا. مێردەکەی گوتی:

ئەوە وەها زەعم دەبا. کە پێغەمبەری وی لە وەختە دا هاتۆتە سەر دونیا. ئەوە گوێزەبانەی وی‌یە دەکا. کە شەوی مەولوودێ داهات.

ژنە جوولەکە لە خەودا دیتی یەک جەماعەت. لە نێویان دانیشتووە زاتێکی بە ویقار. بێ سێبەر و پڕ ئەنوار. شۆخ و شەنگ و مە روخسار. شەکەر خەندەی شیرین گوفتار. قەد عەڕعەڕ و مووکەمەر. مشک موو. عەنبەر بوو. سومبول گیسوو. فریشتە سرشت. جەماڵ بەهەشت. فەسیح زمان. مەلیح دەهان. ددان دوڕی لێو مەرجان. روومەت گوڵی پەرچەم ریحان. وەک مانگی چاردەی نێو ئەستێران. دەڕۆیی بۆ ماڵێ جیرانەکەی مسوڵمان. پرسی لە یەکێکی لەوان. کێ‌یە ئەم سەروی بوستانی گیان. گوتیان ئەوە خاتەمی رەسووڵە. ئەوە هادیێ سوبولە. مەحرەمی ئەسراری خودایە. ناسخی دینی عیسا و مووسایە. ناوی مبارەکی حەزرەتی «محمدالمصطفی» یە. گوتی: ئەگەر بانگی بکەم جوابم دەدا؟ گوتیان: بەڵێ تەکەبور و عینوانی نیە ئەبەدا. گوتی یا محەممەد، فەرمووی «لبیک» یەعنی لە خزمەتت راوەستاوم. گوتی: ئەی نووری چاوم. کوڵەکەی دینم. کزەی جەرگم. رۆح و هەناوم بە قوربانت بێ. ئەتوو چلۆن بە «لبیک» جوابم دەدەی. خۆ من دین دوژمنی تۆم. فەرمووی قەسەم بەوکەسەی کە ئەمنی گێڕایە بە پێغەمبەر. وەهام جواب نەدەدایەوە هەتا نەمزانیوە کە هاتوویتیە سەر دینی خۆم. ژنە جوولەکە عەرزی کرد: یا محەممەد چ بڵێم؟ فەرمووی: بڵێ «اَشهَدو اَن لا اِلَهَ الاالله و اَشهَدو اَنّ مُحَمَّد رَسوِلَ‌الله». ژنە جوولەکە مسوڵمان بوو. هەر لە خەوێدا نەزری کرد. چونکە خودا هیدایەتی دا. هەموو ماڵی خۆی بکاتە خێرات. کە سبحەینێ وەخەبەر هات، دیتی مێردەکەی دروست دەکا نان و چێشت و تەعام. پرسی لە مێردەکەی ئەوە چ دەکەی؟ کوتی ئەوە بۆ ئەوکەسەیە، کە لە سەر دەستی قەبووڵت کردی‌یە دینی ئیسلام. ئەوەی هاتە لای تۆ، هاتە لای منیش. «صَلّوٌ عَلَیهِ وَسَلّم تَسلیما».

مــەرحــەبا، یــا مــەرحــەبا، یــامەرحــەبا
مــەرحــەبا«جــدالحســێن»ی مـەرحـەبا
مــەرحــەبا ئـەی سـەییدی دونـیا و دیـن
مــەرحــەبا ئــەی شــافعی رۆژی جــەزا
مەرحەبا ئەی شـاهی جـەمعی مـورسەلین
مــەرحــەبا ئـەی تـائیری عـەرشی خـودا
ئــەوشۆ مــەولوودی حــەبیبی خــالقە
ئەی گـەلی ئـۆممەت بکـەن زەوق و سـەفا
ئـەی مسـوڵمانان هــەموو تـێکرا بڵێن
یــا رەسـووڵەڵڵا هــەزاران مــەرحــەبا
ســەد درووود و سـەد تـەحییات و سـەلام
بــەر جــەماڵی پــاکــی تـۆ یـا مسـتەفا
بـۆ ئــەمینی روو سـیاه و پـڕ گـوناه
رۆژی مەحشەر هەر ئەتۆی پشت و پەناه

ئەسلی ئیجادی فەخری ئەولادی ئادەم ئەمەیە. لە پێش کوللی مەخلووقی دا، نووری حەزرەت، بە هەزار و شەش سەد و هەشتا ساڵی ئیجاد کـرا. دوازدە پەردەی لە بۆ تەرتیب درا. پەردەی قودرەت و عەزەمەت و مننەت. رەحمەت و سەعادەت و کەرامەت. مەنزیلەت و هیدایەت و نەبووەت. رەفعەت و هەیبەت و شفاعەت.

دوازدە هەزار ساڵ لە پەردەی قودرەتدا تەسبیحاتی ئەوە بوو «سُبحانَ رَبّی الاعلیٰ». یازدە هەزار ساڵ لە پەردەی عەزەمەتدا تەسپێحاتی ئەمە بوو. «سُبحانَ عالَم اَسرا و اَخفیٰ». دە هەزار ساڵ لە پەردەی مـننەتدا تـەسبێحاتی ئـەمەبوو. «سُبحانَ الرَفیع الاعلیٰ». نۆ هەزار ساڵ لە پەردەی رەحمەتدا تەسبێحاتی ئـەوە

بـوو. «سُبحانَ الحَيّ القَيّوم». هـەشت هـەزار سـاڵ لە پـەردەی سـەعادەتدا تەسبیّحاتی ئەمە بوو: «سُبحانَ مَن هوَ دائیم لایَسهوُ». حـەوت هـەزار سـاڵ لە پەردەی کەرامەتدا تەسبیّحاتی ئەوە بوو: «سُبحانَ مَن هوَ غنيٌ لا يقتَصِرُ». شەش هەزار ساڵ لە پـەردەی مـەنزەلەتدا تـەسبیّحاتی ئـەوە بـوو: «سُبحانَ العَليم الحَكيم». پێنج هەزار ساڵ، لە پەردەی هیدایەتدا تەسپێحاتی ئەوە بوو: «سُبحانَ ذي العَرش العَظيم» چار هەزار ساڵ لە پەردەی نەبووەتدا تەسبیّحاتی ئەوە بوو: «سُبحانَ رَبکَ رَبَ العزة عَما يَصفَعوُن». سێ هەزار سـاڵ لە پـەردەی رەفـعەتدا تەسپێحاتی ئەوە بوو: «سُبحانَ ذيَ المَلِك و المَلَكوُت». دوو هـەزار سـاڵ لە پەردەی هەیبەتدا تەسبیّحاتی ئەوە بوو: «سُبحانَ الله و بَحَمدهِ». هەزار سـاڵ لە پەردەی شەفاعەتدا: تەسبیّحاتی ئەوە بوو: «سُبحانَ الله العَظيم و بِحَمدِ يا اللهُ يا كَريم».

بەعدەز ئان. خوداوەندی عەزیموشەئن. دە بەحری خەڵق کـردن. ئـەوەڵ بەحری شفاعەت. نووری حەزرەتی محەممەد. هەزار ساڵ تێیدا مەلەی دەکرد. دەیفەرموو: (رەببی ، رەببی، دووهەم بەحری نەسیحەت. دوو هەزار ساڵ لەوێدا مەلەی دەکرد. دەیفەرموو: «الهی ، الهی». سێهەم بەحری شوکر. سێ هەزار ساڵ لەوێدا مەلەی دەکرد. دەریفەرموو: «سەییدی، سەییدی». چوارەم بەحری سەبر. چوار هەزار ساڵ لەوێدا مەلەی دەکرد. دەیفەرموو: «یـا ئـەحەد، یـا ئـەحەد». پێنجەم، بەحری رەحمەت. پێنج هەزار ساڵ لەوێدا مەلەی دەکرد. دەیفەرموو: «یا رەحیم، یا رەحیم». شەشەم، دەریای موحیبەت. شەش هەزار ساڵ لەوێدا مەلەی دەکرد. دەیفەرموو: «یا عەلی، یا عەلی». حەوتەم دەریای عیزەت. حەوت هەزار ساڵ لەوێدا مەلەی دەکرد. دەیفەرموو: «یا عەزیز، یا عـەزیز» . هـەشتەم دەریای حیلم. هەشت هـەزار سـاڵ لەوێدا مـەلەی دەکـرد، دەیـفەرموو: «یـا رەئووف، یا رەئووف». نۆهەم، دەریای تەناعەت. نۆ هەزار ساڵ لەوێدا مـەلەی دەکرد. دەیفەرموو: «یا سەبوور، یا سەبوور». دەهەم دەریای رەفعەت. دە هەزار

ساڵ لەوێدا مەڵەی دەکرد. دەیفەرموو: «سبوح قدوس یا الله یا کریم».

بەعدەز ئان. لە گۆشەی دەهەمین. سەججادەیەکی نوورین. حەوت هەزار هێندی ئاسمان و زەمین. رایەخرا لەم سەججادەیە حەوت سەد مەقام تەرتیب درا. ئەوەڵیان مەقامی تەوحید. ئاخیریان مەقامی موحیبەت. نووری حەزرەت لە هەر مەقامێکی هەزار ساڵ مەشغووڵ بوو بە تەسپێحاتی حەزرەتی« ذالجلال». لە پاشان خوداوەندی «عظیم‌الشأن» فەرمووی: ئەی نووری حەبیبی مـن. ئـەمن کێم؟

کوتی: ئەتۆ خالقی منی. رازقی منی. مەولای منی. خودای منی. غەفووری منی. سەبووری منی. مەعبوودی منی. مەقسوودی منی.

خودا دەیفەرموو: ئافەرین ئەی نـووری خـاس. چـاکت نـاسیوم. ئـەمما عیبادەتێکم لە بۆ بکە بە ئیخلاس. تا هەموو کەس بزانن نیشانەی مـەعریفەت. مەشغوڵی بەندەیە بە تاعەت.

ئەو جار ئەو نووری حەزرەتی ساحێب جەماڵ. مەشغووڵ بوو بە عیبادەتی فی‌الحاڵ. ئەوەل دەفـعە هـەڤدە هـەزار سـاڵ، لە خـزمەت مـەلکی مـوتتەعال، راوەستا. خودا قەبزەیەک لە نووری پاکی خۆی بە سەردا رژاند بە خـەڵات. لە موقابیل ئەم شەفەقەتە، سوجدەی شوکرێی برد. خودا نوێژی سبحەینێی لە سەر وی و لە سەر ئوممەتی وی فەرزکرد. دیسان هەستاوە. لە مەقامی خزمەت هەفدە هەزار ساڵ قیامی کرد. دوو بارە خودای تەعالا لە نووری خاسی خۆی خەڵاتی کرد.

حەزرەت دیسان سوجدەی شوکرێی برد. خودای تەعالا نوێژی زوهرێی لە سەر وی و لە سەر ئوممەتی وی فەرزکرد. تا پێنج دەفعە بەم دەستووره عەمەلی کرد. پێنج فەرزەی لە سەر وی و لە سەر ئوممەتی وی فەرزکرد.

بەعدەزئان ئەمری کرد خودا. دوو رکەعەت نوێژم بـۆ بکـە. دوو رکـعەت نوێژی کرد بە شازده هەزار ساڵ. فـەرمووی مـەلکی مـوتتەعال. ئـەی نـووری

حەبیبی خۆم. قەبوولم کرد ئەو نەمازە. چ مەقسوودت هەیە ئیزنم دای لێم بخوازە. کوتی:

خودایە. ڕەجام وایە. خێری ئەم نوێژە بە ئۆممەتم کەرەم بکەی. لێیان خۆش ببی. لە جەهەننەم عەزابیان نەدەی.

خودای تەعالا دەیفەرموو: ئافەرین ئەی نووری شفیع‌المذنبین. قەبوولم کرد کەلامت. بە جێم هێنا مەرامت. ئەلحەق ڕەجات بە جێ بوو. ئەمن ئەوەم دەویست لە توو.

کە نووری حەزرەتی محەممەدی موختار. ئەم کەرەم و نەوازشەی دیت یەکجار. سەد و بیست و چوار هەزار قەترە بە ئەژمار. چەک چەک لێی چەکانە خوار. هەر یەک بوو بە ئەسلی پێغەمبەرێکی نازدار.

ئەی پەناهی ئۆممەتی، ڕوحم بە قوربانی تۆ
لە ڕۆژی قیامەتی، دەستی مە و دامانی تۆ
سەییدی دونیا و دین، ڕەحمت اللعالمین
پێشەوایی مورسەلین، ساحێبی قورئانی تۆ
تایری هەر نۆ فەلەک، سەلەوات لێت بن گەلەک
ئینسان و جن و مەلەک، بوونە سەنا خوانی تۆ
سەییدی کەونەین ئەتۆی، شاهی سەقەلەین ئەتۆی
جدالحسنین ئەتۆی حەبیبی یەزدانی تۆ
«شفیعا لمذنبین»ی، شاهی دونیا و دینی
پشتیوانی ئەمینی، پەناهی عاسیانی تۆ

بەعدەزئان خوداوەند، نووری حەزرەتی کردە دەحیسە. لە حیسەی ئەوەل. عەرشی ئیجاد کرد. عەرش تەختی خودایە. چارسەت هەزار ڕوکنی لە بۆ تەرتیب

درایە. مابەینی کوللی روکنان. چارسەت هەزار ساڵ رایە. ئەو عەرشە عەزیمە لە سەر شانی چوار مەلایکەتان داندرایە. لە حیسەی دووهەم قەڵەمی ئیجاد کرد. پێنسەت ساڵ رێی درێژە. چل ساڵ رێی پانە. مەئموور بە ئەمری رەحمانە. خودای تەعالا فەرمووی: ئەی قەڵەم بنووسە. کوتی: چ بنووسم ئەی رب‌العالمین؟ فەرمووی: بنووسە بە نووسینێکی سەلیم. «بِسمِ‌اللهِ الرَّحمنِ الرَّحیم» کە قەڵەم گەیشتە لەفزی ئەڵڵا لە هەیبەتان شەق بوو. هەر دوو سەری لێگدی جودا بوو. بە ئیسمی الرَحمنَ‌الرَحیم، چاک بۆوە. وەک قەڵەمی وێستاکە. بە هەزار ساڵ تەواوی کرد ئەو کەلیمە پاکە.

ئەو جار قەسەمی خوارد خودای تەعالا. فەرمووی: بەعیزەتی خۆم، هەر کەسێ لە ئۆممەتی محەممەدی سەلیم. جارێکی بڵێ «بِسمِ‌اللهِ الرَّحمنِ الرَّحیم». سەوابی حەوسەت ساڵی دەدەمێ. شادی دەکەم بە جنّات‌النعیم.

بەعەدەزئان عەدەدی قەترەیی باران. گەڵای درەختان. رەملی دەشتان. حبووباتی ئەرزاقی مەخلووقات. شەو و رۆژ و دەقیقە و سەعات. چی لە دونیا روو بدات. هەمووی نووسی بە ئیسبات. لە بۆ ئۆممەتانی نووسی: هەر کەس ئیتاعەم بکا. جێی جنات النعیمە. ئەوی بێ ئەمریم بکا. جێی مەکانی جەحیمە.

کە ئیرادەی کرد لە بۆ ئۆممەتی حەزرەتی پێغەمبەر. وەکوو وانی دی بنووسی لە دەفتەر. خودای تەعالا فەرمووی: ئەی قەڵەم، مەنووسە وەکوو وانی دی لە بۆ ئۆممەتی محەممەدی موختار. بەڵکە بنووسە ئەوەی بێ ئەمریم دەکا. ئۆممەتێکە گونەهکار. ئەمما خودایان رەحیمە و غەففار. قەڵەم گوتی: یارەبی ئەو محەممەدە کێ یە وا خۆشەویست و بزورگەوار. خودای تەعالا فەرمووی ئەی قەڵەم. بە جەلالی خۆم قەسەم. ئەگەر ئەو نەبوایە. نەمدەخولقاندن ئەرز و ئاسمان و هیچ ئەشیایە. قەڵەم کە ئەوەی بیست سوجدەی تەعزیمی لە بۆ حەزرەتی برد. لە پاشان سەری بڵیند کرد. بە ئەمری خودای تەعالا سەلامێکی لێ کرد. خودای تەعالا لە باتی حەزرەتی جوابی سەلامی داوە. لەو رۆژەوە سەلام کردن سوننەتە،

جوابی فەرزە.

لە حیسەی سێهەم: لەوحی تەرتیبدا. کە دوورڕێکی بێزایە. لە کەنار مەلایکەتێک داندرایە. رۆژی سەدو شێست جار مەنزووری نەزەری خودایە. بەعزەکان زیندوو دەکا. هێندەکان دەمرێنێ. عەزیزان زەلیل دەکا. زەلیلان عەزیز دەکا. فەقیران غەنی دەکا. غەنی یان فەقیر دەکا. ساغان نەخۆش دەکا. نەخۆشان ساغ دەکا. ساڵحان فاسق دەکا. فاسقان ساڵح دەکا.

لە حیسەی چوارەم: مانگی ئیجاد کرد. لە حیسەی پێنجەم رۆژی خەلق کرد. بەحرێکی سی هەزار ساڵ ڕێی لە هەوا موعەللەق راگرت. مانگ و رۆژی وەک ماسی، دەنا و ئەو بەحرەدا جاری کرد. ئەگەر ئەو بەحرە نەبوایە. روخساری تابداری مانگی سەراسەر ئاشقی دەبوون. وەک بوت‌پەرەستان سوجدەیان لە بۆ دەبرد. ئەگەر ئەو بەحرە نەبوایە. حیجابی تابداری رووی رۆژی دونیا و مافیهای دەسووتاند. هەموو شتی عەدم دەکرد. هەموو رۆژی لە نووری عەرشی نوورێکی داوێنە سەر. حەرارەتێکی نوێی دەکەنە بەر. رۆژی دی ئەو نوورە بە نوورێکی دی دەگۆردرێتەوە. ئەو حەرارەتە دەهاوێژرێتە سەر جەهەننەم. حەرارەتێکی دی دەبەر دەکەنەوە. کە رۆژی قیامەتی داهات. هەموو حەرارەتەکەی پێ دەدرێتەوە. هەموو نوورەکەی لێ دەستێندرێتەوە. بە عەرشی عەزیم کەرەم دەکرێتەوە. زوڵمەت بە نەهایەت دەگا. حەرارەت ئینسانی دەسووتێنێ. بە قەدەر ماڵی کەوانی، یا قەبزەی دەستی. چڵ‌گەز لە سەری مەخلووقاتی رادەوەستی. ئینسان زۆر حەز دەکا بمری. ئەمما قەت نامری.

لە حیسەی شەشەم بەهەشتی خەڵق کرد. کە مەکانێکە هیچ چاو، جێی وا خۆشی نەدیوە. هیچ گوێ دەنگی وای نەبیستووە. مەکانێکی زۆر دڵگوشایە. هەرچی بە دڵ حەز بکەی. کەیفت لێی بێ تێیدا حازر و مەهەییایە. ڕێگەی ئیتباعی حەزرەتی «محمدالمصطفی‌یە». «صَلّوُ عَلَهِ وَسلّم تَسلیما».

ئـــەگـــەر لە دونـــیا ســـاحێب گـــوناهم
لە رۆژی مـــــەحشەر ئـــــەتۆی پـــەناهم
بـــە ئـــاه و شـــیوەن دەكـــەم رەجـــایێ
رەحـــمێك بـــفەرمووی بـــە شـین و ئـاهم
گـــەدا لە دەركـــی شـــەهان دەبـــن شـاد
ئـــەمن گـــەدامـــە و تـــۆی پـــادشاهم
خـــەرمان و روحـــمی تـــۆ بـــێ حیسابە
عـــەتا بـــفەرمووی یـــەك پـــەڕڕەكـاهم
بـــۆ خـــاتری قـــورئان لە رۆژی مـــەحشەر
یـــــارەب ســـپیكەی دوو رووی ســـیاهم
ســـەد حـــەیف و حـــەسرەت «ئـەمین»ی ئـوشنۆ
بـــە خـــۆڕایـــی چـــوو عـومری تـەباهم

بەهەشت، هەشت تەبەقەیە. ئەوەڵ«دارالجلال »ە. مەجمووع لە مرواری سپییە. دووهەم «دارالسلام» ە. لە یاقووتی زەردە. سێهەم «جنّت‌المأوا »یە . مەجمووع لە زەبەرجەدی کەسکە. چوارەم «جنت‌الخلد»ە. لە یاقووتی سوورە. پێنجەم «جنت‌النعیم»ە. لە زێوی ئیجاد کراوە. شەشەم «جنت‌الفردوس»ە. ئەویش لە مشکی ئەسفەرە. هەفتوم «دارالقرار»ە. لە زێڕی خەڵق کرایە. هەشتەم« جنّت‌العدن»ە. لە لوئلوئی تەڕە. رۆژی قیامەتی کە دەچینە بەهەشتێ. رۆژی شەنبە. نۆبەتی دەعوەتی ئادەم «صفی الله»یە. رۆژی یەکشەنبەی نۆبەتی دەعوەتی ئیبراهیم «خلیل‌الله»یە. رۆژی دووشەنبە، نۆبەتی دەعوەتی نووح «نبی‌الله»یە. رۆژی سێ شەنبە، نۆبەتی دەعوەتی مووسا «کلیما لله»یە. رۆژی چوارشەنبە، نۆبەتی دەعوەتی عیسا« روح الله»یە.رۆژی پێنج شەنبەی نۆبەتی دەعوەتی محەممەد «رسول‌الله»یە. رۆژی جومعە،نۆبەتی دەعوەتی حەزرەتی

مەولا یە.

مەجمووعی پێغەمبەران دەگەڵ ئۆممەتان لە خزمەت جەنابی رەسوولوڵلا، دەچن بۆ زیافەتی مەولا. حازر دەبن لە «خطیرةالقدس». دادەنیشن لە هـوودەی تەنەفوس. بەعدەزئان هەر کەس لە مەقامی خۆی قـەراری دەگـری. لە تـەرەف جەنابی باری مەرحەبایان لێدەکـری. خـودای تـەعالا دەفـەرموی:«یـا کـروب فکّهوهُم». میوەیان لە بۆ دێنن تـا سـەد سـاڵ. بـاز مـەرحـەبایان لێ دەکـری. دەفەرموی: «یا کروب اطعمّوهُم». تـەعامیان لە بـۆ دێـنن تـا سـەد سـاڵ. بـاز مەرحەبایان لێ دەکا دەفەرموی: «یاکروب توحّوهُم». تاجیان لە سەر دەنێن. باز مەرحەبایان لێ دەکا. دەفەرموی «یاکروب ختمّوهُم». ئەنگوستیلانیان دەدەست دەکەن. باز دەفەرموی: «طیّبوهُم». بێن خۆشیان دەکەن. بەعدەزئان مەخلووقات بەخیلوە قسە دەکەن. «حیّ و قیوم» دەفەرمووی: یا مـحەممەد ئـەتۆ سـەییدی ئەبراری. وەزیری موختاری. بزانە خیلوەی ئەو مەخلووقە بۆ چیە؟ کە حەزرەت سوئالیان لێدەکا، دەڵێن: یا سەییدی، ئێمە تالیبی دیدارین. لە دونیایە وەعدەی وا دایە «رَبَ العالَمین». ئەوجار خودای تەعالا هـەفتاد هـەزار پـەردە لا دەبـا. جەماڵی خۆی نیشانی مـەخلووقاتی دەدا. لە پـاشان هـەموو مـەخلووقات کـە دەگەرێنەوە، تیکرار تەجەللایەکی خاس لە بۆ حەزرەتی ئەبووبەکری سـەدیق دەکا.

بەعدەزئان،« ابدالابد»، لە بۆ پیاوان هەموو رۆژی تەجەللایە. لە بۆ ژنـان سەبەب بە نەزەرکردنی مەحەببەتی دونیایی غافل لە خودای، جێژنە و جـێژنی لەقایە. «صَلّوُ عَلَیهِ وَسَلِم تَسلیما».

لە حیسەی هەفتوم، مەلائیکەی ئیجاد کردن کە عەبدی خودان. شەو و رۆژ هەر لە تاعەت دان. نە خەویان هەیە نە خواردن. نە بورژینیان هەیە، نە نوستن. لە هەموو مەخلووقی زۆرترن. جیسمیان لەتیف و نوورانین. نـە نـێرن، نـەمێ. تـا رۆژی حەشری دەمێنن.

لە حیسەی هەشتوم: کورسی خەلق کرد. کورسی دانە لوئلوّیە کە حەوت ئاسمان و زەمین، لە موقابیل وی، وەک هەلّقەیەکە دانێن لە بەرابەر سەحراییێکی بەرین. ئەویش لە موقابیل عەرشی وەهایە. بە قەلّەمی قودرەت «آیتالکرسی» یە لە ئەترافی نووسرایە. لە لای راستەی دە هەزار کورسی داندرایە. لە تەرەف چوّپەی دە هەزار کورسی نەسب کرایە. لە سەر هەر کورسی یەکی، دە هەزار مەلائیکەت دانیشتوون. ئایەتەلکورسی دەخوێنن. خێری ئایەتەلکورسی خوّیان بە ئوّممەتی محەممەد دەگەیەنن. هەر کەس لە پاشی نوێژان ئایەتەلکورسی بخوێنی، ئەمما بە رەوانی. بە قەدەر گرانایی کورسی خێراتی داوێنە سەر تەرازووی خێری.

لە حیسەی نوّهەم: ئاوی ئیجاد کرد. بە نەزەر هەیبەتی پەروەردگار ئاو هاتە جوّش. پێی نەما سەبر و قەرار. کەفی کرد بێ حیساب و بێ ئەژمار. عەرز لەو کەفەی خەلق کرا. بوخاری لێ بلّیند بوو، ئاسمان لێ تەرتیب درا. لە مەوجی ئەو ئاوە خەلق بوو کێو و چیا. بەرق لە کێوانی دا. ئاسن لەوی بوو پەیدا. بەرد و ئاسن لێک خشا، ئاگر لەوی بوو ئاشکرا. لەو ئاگرەی بە یەک دەم. ئیجادی کرد جەهەننەم. جەماعەتی ئەجننان لە بلّیسەی خەلق کران. بەهەشت لە ژوور ئاسمانانە، جەهەننەم لە ژێر ئەرزانە. بەم تەرتیبە قەرار درا. سبحان اللە لە خودایە. چ قادرێکی تەوانایە. چ خالقێکی دانایە. چ وەزعێکی روّنایە. پەناهم بەتوو ئەی خودایە.

لە حیسەی دەهەم: جەوهەری نووری حەزرەتی «محمدالمصطفى» یە».
«صَلّوُ عَلَیهِ وَسَلَم تَسلیما».

تۆ سەیید و سەرداری، لە روّژی میزانی

ئەحمەدی موختاری، ساحێبی قورئانی

سالّی پەنجا و دوو، بوراق بوّت نازیل بوو

دە شەوی مێعراجی، کە چووی بوّ دیوانی

تــــۆ شــاهی لەولاکــی، ســواری ئــەفلاکــی
لە عــەرشێ تــا خــاکــی، بــۆت هــاتە کــێشانێ
مــەعدەنی ســەفا تــۆی، مــەنبەعی وەفــا تــۆی
فــــخرالانــــبیا تــۆی، شــای ئــاخر زەمــانێ
ئــەمان یــا مــحەممەد، دەســتی مــەو دامــانت
ئــــیمانێ حــــیفزکەی وەخــتی رۆح کــێشانێ
ئــــەمین زۆر گــــەدایــــە، لە داری دونــــیایە
هــــەمیشە مــوحتاجە پــێی بکــەی ئــیحسانێ

بەعدەزئان، بە فەرمانی رب‌الجلیل. جـوبرائـیل و مـوکائیل و ئـیسرائـیل. مسقاڵێک خاکی پاک. لەو جێگەیەکە ئێستاکە رۆڵەی مـوتەهەرەیە، هـێنایان چوست و چالاک. بۆ نووری شاهی لەولاک. ئەمری کرد رب‌العالمین. فەرمووی:

ئەی جوبرەئیلی ئەمین. بێنە لە بەهەشتێ کافوور و موشک و زەعـفەران و سونبول و مائی موعین. سەلسەبیل و شەرابی تەسنیم. تـێکەڵیان بکـە دەگـەڵ خاکەکی بە عەمیم. دەرساعەت جوبرەئیلی سەلیم. چووە جنّات‌النعیم. هەمووی هێنا و هاتەوە بە یەک دەقیقە و نیم. گوتی خودایە، حەز دەکەم بزانم بۆ چیە ئەو هەموو ئەشیایە. فەرمووی: بە کافووریێ، هێسکی حەزرەتی محەممەدی خەلق دەکەم. لە زەعفەرانێ. زگی تەرتیب دەدەم. لە موشکێ، خـوێنی. لە تـەسنێمی بێنی. لە سونبوڵی مووی تابداری. لە سەلسەبیلێ گوفتاری. لە مائی موعین لێو و زاری. قوتوویەک لە وان دروست کرا. نووری حەزرەت تێنرا. بە ئەمری خودای سەد هەزار مەلائیکە بە دەفتەر. لە عەرز و عاسمان گێرایـان نـووری حـەزرەتی پێغەمبەر. جوبرەئیل وەکوو جارچی دەیفەرموو:

ئەوە نووری حەزرەتی «شفیع المذنبین»ە. ئەوە نووری «خاتم‌المرسلین»ە. بەعدەز ئان ئەم قوتووە نوورانیان وەکوو قەندیل. هەڵیان ئاوەسی بە پـێچکی

عەرشی جەلیل. مەشغوولْ بوو بە تەمجید و تەکبیر و تەسبێح و تەهلیل.

راوی دەڵێ: ئەو ئەرزە دە پێشدا جێی مە نەبوو. بەڵکوو جێی ئەجننان بوو. کە بیْ ئەمری خودایان کرد. مەلائیکەتان هاتنە سەریان، هەموویان بە هیلاک بردن. عەزازیل کە وێستا شەیتانە بە ئەسیرییان برد. لە ئاسمانی مەشغوولْ بوو بە تاعەت و عیبادەت. بە غایەتێکی هیچ جێگە نەما کە ئەو سوجدەی لیْ نەبا. بووە ئوستادی مەلائیکەتان. بووە گەورەی عەرز و ئاسمانان. ئەوەلْ، خەزانەداری بەهەشتیْ لە بوْ وی تەعیین کرا. ئەگەر مەلائیکەتان مەخسوودێکیان هەبا لە بارەگاهی خودا. هەر ئەو لە بوْ وانی دەکرد رەجا. هەتتا دیتی لە لەوحیْ دا. کە یەکێک لە موقەڕیبانی خودا. مەلعوون دەبێت و رووسیا. مەلائیکە دەستە بە دەستە دەهاتنە کنی لە بوْ دوعا. دوعای لە بوْ وان دەکرد .لە بەر مەغرووری یان لە بوْ خوێی نەدەکرد. دەفعەیەکی دیتی لە دەرگای بەهەشتیْ نووسرایە. کە ئەنقەریب یەکێک لە موقەڕیبان دەکا بیْ ئەمری خودایە. کوتی: ئەی پەروەردیگاری عالەم، ئیزنم بدە تا بەر دەوام لەعنەتان لەو بەندەیە بکەم. خودا ئیزنی دا هەزار سالْ دەستی لە تەدریس هەڵگرت. عەلەددەوام، لەعنەتی لەو بەندەیە دەکرد. هەم هەزار سالْ کە سوجدەی دەبرد. لە عەرز و لە ئاسمان. دیتی لە جێی سوجدەی نووسرایە: «لَعنَةُالله عَلَى الشَیطان». ئەویش ئەو کەلیمەیەی دەکوت زۆر بە هەوەس. نەیدەزانی لەعنەتان لە خوێی دەکا ئەو سەگی بێکەس.

کە خوداوەندی عالەم موتەعەلیق بوو بە ئیجادی حەزرەتی ئادەم. ئەمری کرد جوبڕەئیلی ئەمین. هەستە برۆْ سەر رووی زەمین. بێنە چەنگێک خوڵی رەنگین. کە جوبرەئیل هاتە سەر عەرزی. عەرز دەستی کرد بە شین و گریان ونالین. بە قور پیێوان و هاوار، هاوار و روْ روْ. بە جوبرەئیلی کوت، خوْم پاراست بە خودا لە توْ. عەلاقەم مەکە. بەروکم بەردە برۆْ. فەقیرم، زەلیلم، دلْ بە غەم. نیمە تاقەتی جەهەننەم. ئەو جار جوبڕەئیل چووە ئاشیانەیی مەلەکووت. واقیعەکەی

گێڕاوە بۆ بارەگاهی جەبەڕووت. ئیسرافیل و میکائیل، یەک یەک وەکوو جوبرائیل. چوون و هاتنەوە بە تەعجیل. بەعدەزئان ئەمری کردە ئیزرائیل کە هادم الذات ئەتۆی. هیچ لەحزە رامەوەستە، برۆ چەنگێک خاک لە سەر رووی زەمین بێنە و وەرەوە. ئیزرائیل هات بە چوستی. لە ئەرزی قایم کرد دەستی. ئەرز گوتی: بۆچ وا سەرمەستی؟ بە ئیشقی خودا ئەگەر رانەوەستی. هیچ چەنگانم لێ مەدە. ئیلاقەم مەکە. بەرۆکم بەردە برۆ. ئیزرائیل فەرمووی: پیرێژنی پشت کوور: ئەو قسانە چیە دەکەی؟ ناڵە ناڵی پیرێژنان لەکن من قەدری نیە. هاوار هاواری یەتیمان لەکن من ئیعتباری نیە. گەدا لەکن حوکمی پادشای چ ئیقتیداری هەیە؟ بەندە لە موقابیل حوکمی خودای چ ئیختیاری هەیە؟ بە یەک چەنگ مقداری چل گەز خاک، لە هەموو رەنگێکی هەڵگرت. لە مابەینی مەککە و تایفی رۆکرد. خودا فەرمووی: تەئۆ بۆ چ وەکوو وانی دی، رەحمت نەبرد بە حاڵی ئەرزی؟ کوتی: خودایە، ئەمری تۆم لەکن گەورەترە، لە رەحم پێ بردن بە ئەرزی. خودا فەرمووی کە وابێ، ئەتۆمکردە قابیزی ئەرواحی ئەو تایفەیەکە لەم خاکەی دروست دەکەم بە واجبی و بە فەرزی. گوتی: یارەببی دەبمە مەبغووزی ئەنبیا و سولەحای رووی ئەرزی. چونکە مردن زۆر ناخۆشە. دڵی هەموو کەس لە بەر دەلەرزی. سەری چۆکیان دەتەزی. خودا فەرمووی: عیللەتان بۆ مردن زۆر دەکەم. وەکوو تاعوون و وەبا. تا و لەرزین. کەس نیسبەتی وەلای تۆ نادا. بە عیزەت و جەلالی خۆم. هەرکەسی ئەتۆ بە دوژمن بزانی، ئەمنیش ئەو بە دوژمن دەزانم.

بەعدەزئان سی و نۆ رۆژان بە سەر ئەو خاکەیدا باراندی، بارانی غەم و حەسرەت. شەو و رۆژەکی باراندی. بارانی سروور و شادی و عیشرەت. «صَلّوُ عَلَیهِ وَسَلَم تَسلیما».

اَلهُمَ صَلِ عَلی سَیدنا مُحَمَّد

عَلیٰ اٰلِ و اَصحابِهِ شَفیعَنا مُحَمَّد

هەم سەییدی دونیا و دین محەممەدە محەممەد

هەم رحمت‌اللعالمین محەممەدە محەممەد

سوڵتانی رۆژی مەحشەری محەممەدە محەممەد

ساحێبی حەوزی کەوسەری محەممەدە محەممەد

پشت و پەناهی ئوممەتی محەممەدە محەممەد

شەفیعی رۆژی قیامەتی محەممەدە محەممەد

ئەو جار بە قودرەتی خودا. ئادەم بەم هەیبەتە خەڵق کرا. تا چل ساڵی لەوێ بە جێ هێشترا. لە پاشان خوداوەندی عالەم. ئەمری کردە رۆحی بچۆ بەر بەدەنی حەزرەتی ئادەم کە بە یەد و قودرەتی خۆم ئیجادم کردیە لە عەدەم. رۆح کە چاوی پێکەوت دیتی حوجرەیەکی تەنگ و تاریک. گریا بە دەنگی حەزین و ناڵاندی باریک. گوتی: من بولبولی هەزار دەستانی گوڵشەنی ئونسم. قومری سەروی بوستانی قودسم. تووتی شەکرستانی ناسووتم. نەغمە خوانی شاخساری لاهووتم. نایەمە ناو ئەو قەفەسەی نۆکون. ئەگەر بە ئاگری غەزەبت هەموو پەڕ و باڵم بسووتێنی. ئەوجار بە فەرمانی رەبی جەلیل. حەزرەتی جوبرائیل. نووری مبارەکی پێغەمبەری خەلیل. لە پشتی ئادەمی دانا. رۆح کە چاوی پێ کەوت، پێی نەما سەبر و توانا. بە شەوق و زەوق هاتە رەوت. وەژوور بەدەنی ئادەمی کەوت. لە پاشان بە ئەمری خوداوەندی مەننان. ئادەمیان لە سەر تەختی دانا. مەلائیکەتان هەڵیان گرت و دایاننا سەر شان. لە ئەرز و لە ئاسمان. رایان گرت لە بەرابەر عەرشی رەحمان. ئەمر سادر بوو لە لای خوداوەندی عالەم. ئەی مەلائیکەی فەرخوندە قەدەم. هەمووتان سوجدە بەرن بۆ حەزرەتی ئادەم. کە بە یەد و قودرەتی خۆم ئیجادم کردیە لە عەدەم. هەموو کەوتنە سوجدە تا سەد ساڵ. غەیرەز شەیتانی بێ ئیمانی بەد فەعاڵ. جێ بە جێ رەنگی نوورانی موبەدەل بوو. رەش بوو وەک زوغاڵ. فەرمووی مەلەکی موتتەعاڵ. ئەی لەعینی دین بەتاڵ. بۆچ ئەتۆ سوجدەت نەبرد بۆ ئادەمی پڕ کەماڵ. گوتی: ئەمن لەوی

چاترم. ئەسلی وی لە قوریْیە و ئەمن لە ئاگرم. سەبەب بەو تەکەبورەی، تەوقی لەعنەتی لە گەردن کرا. لە درگای رەحمەتیْ دەرکرا.لە پاشان بە حیشمەت و بە شەوکەت. ئادەمیان بردە جەننەت. لەبەر نووری حەزرەت. مەلائیکە لە پشت ئادەم دەستیان دەنا لە سەر دەست. وەک خزمەتکاران رادەوەستان و سەفیان دەبەست. حەزرەتی ئادەم فەرمووی یارەببی، ئەو مەلائیکەتانە بوْچی لە پشتم رادەوەستن؟ خودا فەرمووی: ئەوە دەنوْرنە نووری حەبیبی من کە لەوەی پاش لە پشتی توْ زاهیر دەبیْ. ئادەم کوتی: یارەببی، ئەو نووره بیْتە ناو چاوانم. تا مەلائیکە رابوەستن لە بەر دەستانم. نوورەکە هاتە ناو چاوانی. مەلائیک سەف بە سەف رادەوەستان لە بەر دەستانی.

بەعدەزئان کوتی. یا رەحمان و یا غەففار. بە حەققی محەممەدی نازدار. حەز دەکەم ئەو نووره لە جیگایەکی دی بگریْ قەرار. تا بە دیداری شاد ببیْ ئەو بەندەی گرفتار. جیْ بە جیْ نووری حەزرەت و هەر چاریار. هاتنە پیْنج ئەنگوشتی راستی بە ئەژمار. لە پاشان حەزرەتی ئادەم لە بەهەشتیْ بوْرژا. حەووا لە پەراسووی چوْپی خەلْق کرا. حەزرەتی ئادەم کە وەخەبەر هات. دیتی مەحبووبیْک لە تەنیشتی چوْپی دانیشتووە. ئیرادەی کرد دەستی لە ملانی بدا. نەدایەک هات لە ئاسمانیْ، ئەی ئادەم ئەوەی نەکەی. لیْت حەرامە هەتا مارەی نەدەی. کوتی: یا رەببی چیە مارەی ئەو حوْرللەقایە؟ فەرمووی:دە سەلْەوات لە دیداری حەزرەتی «محمدالمصطفی» یە.

خوداوەندی «عظیم‌الشأن»، ئادەم و حەووای بە غەیرەز داری گەنمی، لە هەموو چیْشتیْ ئیزن دا. کە ئەو حالْەی دی شەیتان. کوتی: دەبیْ بە ئادەم و حەووای بکەم زەللان. هات بچیْتە بەهەشتیْ قەبوولْی نەکرد ریزوان. کوتی: مەلعوون کیْوە دەچی، بەهەشت حەرامە لە توْ و لە جەمیعی کافران. بەعدەزئان دەگەلْ ماری بەست عەهد و پەیمان. دەناو زاری ماری خوْی کرد پنهان. چووە ناو بەهەشتیْ هیچ ئاگای لیْ نەبوو ریزوان. شەیتان خوْی هیْنا سەر شکلْی

سالحان. رۆژێکی لە رۆژان. ئادەم و حەووا لە ناو بەهەشتیٚ دەگەڕان. دەیان کرد سوٚحبەت و سەیران. لە بن داری گەنمی دیتیان. یەک دانیشتووە بە زمان. دەکا زیکری مەلەکی مەننان. دەگەڵیان کەوتە قسان. کوتی: بوٚچ لەو دارەی ناخوٚن چ لوقمان؟ کوتیان نەهی لە خواردنی ئەو دارەی کردووە خوداوەنـدی رەحـمان. کوتی: ئەنگوٚ فەقیرن و هیچ نەزان. ناوی ئەودارەی «شجرەالخلود»ە. قەسەم بە زاتی ئەحەد. ئەمن ناسحێکی ئەمینم بیٚ حەسەد. هەرکەس لەو دارەی بخوا لە بەهەشتیٚدا دەبیٚ مخلّد. ئەوجار مەلعوون هەفتاد دەفعە سوێندی بوٚ خواردن بە خوداوەندی ئەحەد. ئەو جار تەئسیری لیٚ کـردن وەسـوەسەی شـەیتانی بـەد. خواردیان داری گەنمی. نوورەکان چوونەوە پشت ئادەمی. رووت و قووت کران. لە بەهەشتیٚ فڕیٚ دران. چونکە حەووا زوو هەڵخەڵەتابوو بـوٚ خـواردنـی داری گەنمی. ئەویش دابووی تەحریکی ئادەمی. بوٚیە ژن موبتەلا بوون بـە حـەیز و نەفاس. بە گرانی وەزعی حەمل. بە مـیٚحنەتی وەعـدە و نـوقسانی مـیراس. بـە شاهێدی دین و کەم عەقڵی. بە مەحرووومی لە جومعە و جەماعات و غـەزا. بـە نەبوونی هیچ پێغەمبەر لە واندا. کـە ئـادەمیان لە بـەهەشتیٚ هـاوێتە خـوار. لە شەرمان نەینوٚڕییە ئاسمانیٚ چ جار. کردیە گریان و شین و هاوار. لە بەر ئاوی چاوی روٚیی جوٚگە و رووبار. تا پشتێندیٚ لە قوڕێدا چووە خوار. نـەی مـابوو خواردن و خەو و سەبر و قەرار. «تقدیرالله» سەری بڵیند کرد یەک جار. دیتی لە پێچکی عەرشی جەببار. نووسرایە ناوی محەممەدی موختار. دەگەڵ ناوی پاکی پەروەردگار. گوتی: یا رەحیم و یا غەففار. بە حەقی محەممەدی نازدار. خوٚش ببی لە گوناهم. رەحمیٚ بکەی بە شین و گریان و ئاهم. فەرمووی خوداوەنـدی قـەییووم. بـە خـاتری مـحەممەدی، ئـەوە لە گـوناهت خـوٚش بـووم. ئـەگـەر مـحەممەدت کـردبا شـەفیعی جـەمیعی گـونەهکاران. مـەغفیرەتم بـە سـەردا دەباراندی وەک باران.

بەعدەزئان جوبرەئیلی خوٚش مەنزەر. بە قووەتێکی تەمام ئـادەمی لە نـێو

قوریٚ دا هێنادەر. لە سەرکێوی عەرەفاتیٚ دا ناسیەوە حەووای نیک مەنزەر. نووری حەزرەت لە پشتی ئادەم چووە رەحەمی حەووا. شیس لەوی بوو زاهیر عەهد کرا ئەو نوورە دانەنێن ئیللا لە مەملەکەتێکی پاک وتاهیر. پشت بە پشت، رەحەم بە رەحەم ئەو نوورە پاکە هاتە خواریٚ بە پاکی. تاگەیی‌یە پشتی عەبدوڵلاٚی بابی. رەحەمی ئامینە خاتوونی دایکی.

عەبدوڵلاٚ جەوانیک بوو زوٚرلاو چاک. شوٚخ و شەنگ و گەردن پاک. رەنگی دەشوبها بە گوڵی باغ. نووری حەزرەت لە پشتی دا شوٚعلەی دەدا وەک شەوچراغ. لە زاری بێن دەهات وەک موشکیٚ موعەتتەری دەکرد دەماغ. ئەوجار بەرد و دار و گوڵ وگیا کە دەیاندیت جەماڵی عەبدوڵلاٚ. دەیانکوت: مزگێنی لەتوٚ ئەی حامیلی نووری رەسووڵەڵلاٚ. کە گەیشتە حەددی بلووغ، لە ئەتراف و جەوانب. ئەجانب و ئەقارب. دەوڵەتمەندانی عالی میقدار. پادشاهانی روٚژگار. مەیلیان لیٚ بوو بیکەنە زاوای خوٚیان عەبدوڵلاٚی بە کەماڵ. عەبدولموتەلیبی بابی ژنی بوٚنەهێنابوو، تا عومری گەیشتبووە بیست و پێنج ساڵ. ژنی ئینسان و ئەجینان.کچ و بێوەژن و جەوان. سەبەب بە نووری سەییدی ئینس و جان. بە دڵ و جان ئاشق و حەیرانی بوون. عەقڵیان گوٚرابوو، هەموو ببوونە مەجنوون. شەو و روٚژ ریٚیان لێدەگرت. لوتفی خودای لە شەرری وان مەحفووزی دەکرد.

صَلی وَسَلَّم عَلیٰ مُحَمَّد
بوٚ آلِ وَ اَصحابِ دایماً اَبد
یا رەسووڵەڵلاٚ روٚحم بە قوربانت
لە روٚژی حەشریٚ دەستی مەودامانت
یارەب بوٚ خاتری پشتیوانی مەحشەر
یا رەب بوٚ خاتری ئەبووبەکر و عومەر
یارەب بوٚ خاتری عوسمان و هەم حەیدەر
لیٚمان قەبووڵ کەی مەولوودی پێغەمبەر

یارەب بۆ خاتری جـوودی خـۆت یـا مـەوجوود
یـارەب بـۆ خـاتری مـحەممەد و مـەحموود
یـارەب بـۆ خـاتری شـەرافـەتی مـەولوود
رەحـمێکی پـێ بکـەی یـا «اللـهالمـعبودْ»
ئـەوشۆ مـەولوودی ئـەحمەدی مـوختارە
سـوڵتانی مـەحشەر سـەییدە، سـەردارە
ئـامۆزای عـالی حـەیدەری کـەڕارە
سـەڵەواتـی حـەق لەوی، لە چـار یـارە

شێخ حەسەنی بەسری، شێخ ئەحمەدی بەکری. دەفەرموون: لەو وەختەی کە ئیرادەی کردووە خوداوەندی ئەکبەر. زاهـیر بکـا نـووری حـەبیبی خـۆی، حەزرەتی سیدالبشر. حەڕەکەی کرد بە دڵی عەبدوڵڵای بابی پـێغەمبەر. لە بـۆ خواستنی ژنێکی ماە مەنزەر. فەرمووی بە دایکـی خـۆی، فـاتیمەی سـاحێب گەوهەر. بڕۆ بۆ ناو تایفەی قورەیشی یان تایەکێکی پەیدا بکەی لەوان. ساحێبی جەماڵ و حەسەب و نەسەب بێ. شیرین و بە ئەدەب بـێ. سـاحێبی حـوسن و جەماڵ بێ. بە فەهم و عەقڵ و کەماڵ بێ. بە قەد و قامەت ئیعتیداڵ بێ. دایکی رۆیی بۆ نێو تایفەی قورەیشی یان. تێ فکری کەسی وای چاو پێ نەکەوت. بـە میسلی ئامینەی کچی وەهەبی زەهری. کە دایکی گەڕاوە. خەبەری بۆ عەبدوڵڵا هێناوە. هەمووی لە بۆ گێڕاوە. عەبدوڵڵا فەرمووی دووبـارە بـڕۆوە. مـولاحیزە بکەوە. دایکی چۆوە دووبارە مولاحیزەی کردەوە. سەد هەزار جار لە جاران لاو چاکتر و بە شەوکەت تری دیتەوە.

ئەوجار عەبدولموتەلیبی بـابی، ئـامینە خـاتوونی بـە عـەز و نـاز. لە بـۆ عەبدوڵڵایان دەکرد داخواز. دەر ساعەت هێنایان دوو حوققە زێڕ و دوو حوققە ئاڵتوون. سەرفیان کرد، سەد وشتر و سەد گا و سەد مەڕیان کوشتەوە. شایی یەکی زۆریان کرد. لە خۆشی یان فەڕەج و سرووریکی زۆریان حاسڵ کرد. کە شایی لە

بۆ عەبدوڵلا گیرا. عەبدوڵلا بە نیەتی راوی چوو بۆ سەحرا. ئیتفاقەن یەکێک لە کچی پادشای شامی. فاتیمە ناو. کە لاو چاکتر بوو لە مانگی تەواو. دیتبووی لە کتووبی ئاسمانی. کە وەختە لە مەککە زاهیر ببێ پێغەمبەری ئاخرە زەمانی. لە پشتی یەکێک لە فەرزەندانی عەبدولموتەلیبی عەدنانی. هاتبوو ئەو خاتوونە شیرینە. بە خەزێنە و بە دەفینە. بە جەواهێر و خەدەم و حەشەم. خێوەت و بارەگای هەڵدابوو لە سەحرای مەککەی موعەزەم. بەڵکە موشەرەف ببێ بە نووری موکەرەم. هەمێشە دڵ موتەعەلیق بوو بە ویسالی مەحبووب. چاو مونتەزیر بوو بۆ دیتنی مەتلووب. لە نەکاورا چاوی بە جەماڵی عەبدوڵلا کەوت. وەکوو مامزی دەیکرد رەوت. لە دەشهەتان نیوکی کەوت. لە ناو خێوەتی بە دەر کەوت. ئەو نیشانەی کە لە کتووبان دیتبووی، لەویدا چاوی پێکەوت. کوتی: نووری چاوم، جەرگ و هەناوم.دل و رۆحم بە قوربانت بێ. قەدەم رەنجە بکە خیلوەخانەی فەقیران. بە جەماڵی خۆت رووناک بکە حوجرەی تاریکی ئەسیران. عەبدوڵلا دەگەڵی چووە ناو خیوەتی ژەنگاری. دایان نا لە سەر تەختی مورەسەع و مرواری. دەستیان کرد بە قسان لە لێوانیان شەکەر دەباری. چونکە فاتیمە عاشقێک بوو تەواو. دامەنی عەبدوڵلای گرت بە هەشتاو. کوتی: بە قوربانت بێ جەرگ و هەناو. لە شەربەتی وەسڵی خۆت بمدەیە قومێک شەکراو. دەتدەمێ هەزار حوققە ئاڵتوونی تەواو. عەبدوڵلا فەرمووی: ئەی خاتوونی بەلەک چاو. ئەمن زۆر حەز دەکەم بە وەسڵی تۆ شاد بم. ئەمما مومکین نابێ بەبێ تەگبیری بابم. عەبدوڵلا رووی کردە ماڵێ وەک تاوسی سەر مەست. دەستی ئامینە خاتوونیان نا لە ناودەست. ئەوشەوی جومعە بوو دەگەڵی نوست. نووری پێغەمبەری نەقل بوو بۆ رەحمی ئامینە خاتوونی. قەراری گرت راوەستا. کە سبحەینێ لە خەوێ هەستا. حەکایەتی فاتیمەی شامیی عەرزی بابی کرد. بابی فەرمووی زۆر حەز دەکەم لەو مامڵەیە، قەت رامەوەستە. کە فاتیمەی مەهجوور جەماڵی عەبدوڵلای دیت لە دوور. زانی لە لای نەماوە زەرەیەک نوور. گورە

گوری بلێسەی هەناوی دەهات وەک تەنوور. کوتی: ئەی عەبدوڵلا مەقسوودی من لە قەتحی چوڵ و سەحرا، ئەتوو نەبووی وەڵلا وە بیللا. بەڵکە مەتلووبم ئەوە بوو کە شاد ببم بە نووری حەزرەتی رەسوولوڵلا. ئەوشۆ ئەو نوورەت لە جێگایەکی دی دانا. بە چاوی پڕ ئاو. بە جەرگی سووتاو. بە فرمێسکی ئەرغەوانی. بە رەنگی زەعفەرانی. دەگەڵ قافڵەی بە حەسرەت و ئەندووە رووی خۆی لە شامی کرد. لە بەر تەئەسوف و غەم و غوسە لە رێگادا مرد. ئەمما مردنی وی هەر بە تەنها نەبوو. بەڵکە سەد ژنی قورەیشی‌یان بەم خەفەتی‌یە چوو. «صَلوُ عَلَيهِ وَسلّم تَسليما».

| | |
|---|---|
| الصبح بدا من طلعته | والیل دجی من و فرته |
| فاق الرسلا فضلاً و علا | اهدی السبلا لدلالته |
| کنز الکرم مولی النعم | هادی الامم لشریعته |
| ازکی النسب اعلی الحسب | کل العرب فی خدمته |
| سعت الشجر نطق الحجر | شق القمر باشارته |
| جبریل اتی لیلةاسری | والرب دعی لحضرته |
| نال الشرفا والله عفی | عما سلفی من امته |
| محمدنا هو سیدنا | فی الغرلنا لا جابته |

ئەو شەوی کە نووری حەزرەت. لە رەحمی ئامینەخاتوونی قەراری گرت. مەلایکەتان تەبەق تەبەق نووریان بڵاو دەکرد. دەرکەی جەهەننەمی کلیل درا. بەهەشت وەکوو بووکان موزەییەن کرا. حۆریان خۆیان ئارایش دا. سەریان لە قەسر و قسووری بەهەشتی دەرێنا. گوڵی بەهەشتی پشکووتن. نەسیمی جەننەتی ئەنگوتن. غونچە دەمی داوە. کانی وشک ژیاوە. تەیر هاتنە خرۆش. جۆ و جۆبار هاتنە جۆش. حۆری‌یان خۆیان کرد بۆنخۆش. ویلدان« شەرابەنتەهوور» یان کرد نۆش. گوڵەک سوور بوون. گیا پڕ نوور بوون. رێحان دەرکەوت. کەوسەر سەرکەوت. بنەوشە پشکووت. لالە بزووت. مێرگ شین بوون. چەمەن رەنگین

بوون. درەخت هاتە بەر. میوە کەوتە دەر. قورەیشی هەموو قوتار بوون لە گرانی. کەوتنە نێو خۆشی و ویسعەت و ئەرزانی. وابوو خودا نەبێ کەس نەیدەزانی. لە پاشان حەزرەتی جوبریل. بە فەرمانی رەبی جەلیل. دەگەڵ هەشتاد هەزار مەلائیکە هاتن بە تەعجیل. ئالآیەکی سەبزیان لە سەربانی کەعبە چەقاند. رەگی جەرگی کافرانیان پساند. تەختی پادشاهان نگوونسار کرا. زبانیان تاقەتی تەکەللوومی لێ برا. موژدە درا هەر حەوت تەبەقەی گەردوون. کە ئەو نووری مبارەکی مەکنوون. ئەوشۆ نەقل بوو بۆ رەحمی ئامینەخاتوون.

ئەو جار ئیبلیسی خەبیسی پیسی نەجیس. غەدداری، خوێنخاری مەککار. سەحاری. تەراری. ئەدبار. روو رەشی کەری ئەحمەق. بێ مەعریفەتی گوێ لەق. دوو شەقی تەر و تازەی تێ هەڵدرا. کلکی لە ناو گەڵی نا. وەک دێڵە بەبای چل شەو و چل رۆژ. وەک مانگای ژاندار. بە میسلی سەگی هار. لە بەحر و بەر و دەشت و چۆڵ و سەحرای نەیدەگرت قەرار. بەعدەزئان لە سەر چیای ئەبوو قەبیس چریکەیەکی راهێشت. سەگ بە چەگانی وەک سەگ مەگەس. دەوریان دەدا لە راست و چوپ و پێش و پەس. ئەحواڵیان لێ دەپرسی. گوتیان بۆچ دەلەرزی و بۆچ دەترسی. کوتی: لە عاجزیان وەختە بپسێم. لە حەیفان وەختە بدرێم. رەواجمان نەما. پشتمان شکا. نووری خاتم‌الانبیا. ئەوشۆ قەراری گرت لە رەحمی دایکی دا. مەبعووس دەبێ نووری رەخشان. دەشکێنێ بت و ئەسنام. شەراب و قوماری دەکا حەرام. موعجیزان دەنوێنێ. جەبباران دەشکێنێ. دڵی کافران دەسووتێنێ. سەر رەقان نەرم دەکا. رەجمی شەیاتین دەکا. هەتکی سەلاتین دەکا. قەتحی کوفری تەواو دەکا. کافران بلاو دەکا. جێگەیان پێ لەق دەکا. مانگی بە ئەنگوشتی شەق دەکا. بەیداخی دین هەڵدەکا. چوار پەلی زاڵمان پەل دەکا. دنیایی رۆشن دەکا. زەمینی گوڵشەن دەکا. دینی حەق ئیحیا دەکا. هەر چی کوفرە رادەکا. «سیدالمرسلین»ە. «رحمت‌اللعالمین»ە. ناوی مبارەکی ئەحمەد و تاها و یاسینە. بڵیندان دەکا نەوی. هیچ پێغەمبەر نابن لە پاشی وی.

ئۆممەتی وی یە سەردەفتەر. چونکە ئەمر دەکەن بە چاکە، نەهی دەکەن بەمونکەر. کوتیان: ئەی بزورگی مە و ئەی پیرە گورگی مە. لە سەر شەش تەبەقەی عەرزی غاڵب بووین. لەسەر ئەو تـەبەقەیەش غـاڵب دەبین. تـەعمی گـوناهانیان لە لا شیرین دەکەین وەک هەنگوین. ئەو قسەیەی بیست مـەلعوون لە وان. کـەیف خۆشی پەریی‌یە ناوچاوان. کوتی: ئەو جار چاوم پێتان رۆشن بۆوە ئەلعان.

بەعدەزئان. عەبدوڵڵای نەوجەوان. بۆ تجارەت چۆوە شـامیٚ. لە ریگـایە وەفاتی کرد. مەلایکە گریان، گوتیان: یا رەحیم و یا رەحـمان. یـا کـەریم و یـا مەننان. حەبیبی تۆ بە یەتیمی ماوە. کیٚ هەیە بەخێوی بکا ئەو بـەڵەک چـاوە. خودا فەرمووی زەهیر منم. نەسیر منم. موعین منم. لە دایک و بابان موشفیق‌تر منم. ئەو خەبەرە گەیشتە خزمان. دەستیان کرد بە شین وگریان و ئاه و واوەیلا و قور پیوان. خسووسەن ئامینە خاتوونی پەرێشان. بێهۆش بوو تا سیٚ شەو و سیٚ رۆژان. وەک ماری پێچکی دەدا. زگی پر بوو لە ژان. وەک بی ناو ئاویٚ. قامەتی شۆخ و شەنگی هاتە هەژان. لە فەراقی بابی «محمدالمصطفى». عەبدوڵڵا جوانە مەرگ بوو ساحێبی شەرت و وەفا.

مــــــوالی یـــــا مــــوالی یـــا مـــوالی
رســــــول اللــــــه یــــا بــــدر الیـــالی

فـــەلەک بــۆچ وات دەگــەڵ مــن کــرد ئــاخر
لە یـــاری خـــۆت جـــودا کـــردم بـــە تـــاڵی

بـــە عــــەبدوڵڵا دڵــم خــۆش بــوو لە دنــیا
لە پـــێش چـــاوت بـــزر کـــردم جـــەماڵی

جـــەماڵی گـــەرونــــە ئـــەمما بـــە مـــەعنی
لە بـــۆ مـــن مـــوونسە فـــیکر و خـــەیاڵی

لە کـــوێی ئـــەی مـــایەیی رۆحـــی رەوانـــم
کــــە ســـووتاوم لە داخت وەک زوغـــاڵی

شـــــەو و رۆژێ لە دەردی دووری تـــــۆدا
دڵ وگـــیانم وەکـــوو نـــەی هـەر دەنـالٚی
فـــــیغان و ئـــــاه و واوەیــــلا لە دنـــیا
یـــــەتیم مـــاوە حـــەبیبی زوجـــەلالی
دریـــغا بـــۆ روحـــی وەک مـــاهی تـابان
لە ژێـــر خـــاکـێ بـزر بـوو چـاوی کـالٚی
جـــــەوانــــە نـــامرادە بـــۆ چـــی وازوو
ویـــداعت کـــرد لە ئـــەهل و لە عـــەیالی
لە دووری تـــــۆ نـــەما، عـــەبدولموتەلیب
دڵـــی مـــن کـــوو نـــەسووتێتن بـــە حـالٚی
نـــەمێنم بـــۆ تـــۆ ئـــەی بـابی مـحەممەد
لە پـــاشی تـــۆ چ لێ بکـەم عـومر و مـالٚی
لە دنـــیایە ئـــەگـەر لێکـدی جـودا بـووین
لە جـــەننەت پـێم عـــەتاکـەی حـەق ویسالی

ئەو جار ئامینە دەفەرمووی کە حامیلە بووم بە سەییدی سەروەر. ئـەوەڵ مانگی رەجەبێ بوو لە خەودا دیتم: پیاوێکی کەڵەگەتی رەنگ ئەسمەر. فەرمووی مەرحەبا بکە یا محەممەدی سەروەر. کوتم: ئەتۆکێی؟ فەرمووی: ئەمنم ئادەمی ئەبولبەشەر. کوتم: فەرمانت چیە؟ فەرمووی: مزگێنی بێ لە تۆ ئەی ئـامینە کـە حامیلە بوویتی بە سەییدولبەشەر. بە شەفیعی رۆژی مەحشەر.

لە مانگی دووهەم پیاوێک هات بزورگ و رەیس. فەرمووی: «اَلسَلامُ عَلَیکُم یا رَسوُلَ‌اللە» ئامینە کوتی: ئەتوو کێی؟ فەرمووی: ئـەمنم حـەزرەتی ئـیدریس. کوتی: کـارت چـیە؟ فـەرمووی: مـزگێنی بـێ لە تـۆ کـە حـامیلە بـوویتی بـە پێغەمبەرێکی رەیس.

لە مانگی سێهەم، هات زاتێکی عالی سفات. دەیکرد تەمجید و تەقدیس.

فەرمووی «اَلسَلامُ عَلَیکَ یا نَبیَ‌الله»و ئامینە دەڵێ ئەتوو کێی؟ فەرمووی ئەمنم حەزرەتی شیس. کوتی: کارت چیە؟ فەرمووی مزگێنی بێ لە تۆ کە حامیلە بوویتی لە ساحێبی تەئویل و موعجیزە و حەدیس.

لە مانگی چارم زاتێک هات نوورانی وەک رۆح. فەرمووی:«اَلسَلامُ عَلَیکُم یا حَبیبُ‌الله». ئامینە دەڵێ ئەتو کێی؟ فەرمووی: ئەمنم حەزرەتی نووح. دەڵێ: فەرمانت چیە؟ فەرمووی مزگێنی بێ لە تۆ ئەی ئامینە خاتوون، کە حامیلە بوویتی بە ساحێبی غەزا و نوسرەت و فەتح و فتووح.

لە مانگی پێنجەم. زاتێک هات بۆنی دەرۆیی وەک عوود. فەرمووی: «اَلسَلامُ عَلَیکَ یا صَفوَةَ‌الله». ئامینە فەرمووی: ئەتوو کێی؟ فەرمووی: ئەمنم، حەزرەتی هوود. دەڵێ کارت چیە؟ فەرمووی: مزگێنی بێ لە تۆ ئەی ئامینە کە حامیلە بوویتی بە ساحێبی مقام‌المحمود. «وَلواءِ المَعقوُد».

لە مانگی شەشەم، زاتێک هات بە تەعجیل. فەرمووی: «اَلسَلامُ عَلَیکَ یا رَحمَةَ‌الله». ئامینە دەفەرمووی: ئەتو کێی، فەرمووی: ئەمنم ئیبراهیمی خەلیل. دەڵێ: فەرمانت چیە؟ فەرمووی خۆش بە حاڵت ئەی ئامینە، کە حامیلە بوویتی بە پێغەمبەرێکی جەلیل، هەمنشینی جوبرائیل.

لە مانگی حەوتەم. هات شەخسێکی لاو چاک و مەلیح. فەرمووی: «اَلسَلامُ عَلَیکَ یا احتارەالله». ئامینە دەڵێ ئەتوو کێی؟ فەرمووی ئەمنم ئیسماعیل زەبیع دەڵێ فەرمانت چیە؟ فەرمووی: مزگێنی بێ لە تۆ کە حامیلە بوویتی بە پێغەمبەرێکی فەسیح و بەلیغ و مەلیح.

لە مانگی هەشتووم زاتێک هات عالی شان. فەرمووی السلام‌علیک یا خیرةالله. ئامینە دڵێ ئەتو کێی فەرمووی ئەمنم موسی بن عیمران دەڵی فەرمانت چیە. فەرمووی مزگێنی لە توکە حامیلە بوویتی بە پیغمبرێکی کە لە بۆ وی دێتە خوارێ قورئان.

لە مانگی نۆهەم: زاتێک هات مبارەک قەدەم. فەرمووی: «اَلسَلامُ عَلَیکَ

دَنیَ القُوربُ مِنکَ یا رَسوُلَ‌الله». ئامینە فەرمووی: ئەتوو کێی؟ فەرمووی ئـەمنم عیسای بنی مەریەم. کوتی: فەرمانت چیە؟ فەرمووی: مزگێنی بێ لە تۆکە حامیلە بوویتی بە پێغەمبەرێکی گوڵغونچە دەم. لە سەر تۆش دەفع دەبێ دەرد و ئەلەم.

ئـــەوشۆ شـــەوی زەوق و شـــەوق و ســـەفایە
مـــــەولوودی «مـــحمدالمـــصطفی»یـــە
نـــــازل دەبـــــن مـــەلەک لە ئـــاسمانە
بـــە ئـــەمری خـــالقی ئـــەرز و ســـەمایە
چـــەند پـــێغەمبەر دێـــن و دەکـــەن ســـەلامێ
لە خـــــزمەتی ســـــولّتانی ئـــــەنبیایە
خـەمێ مـەخۆن ئـەی ئـوممەت ڕۆژی مـەحشەر
لە بـــــۆ مـــــەمحەممەد پشت و پـــەنایە
گـــونەهکارین گـــەلێک ئـــەمما ئـــومێدن
«لا تَـــــقنطوُ» فـــــەرمایشی خـــودایـــە
بـــە مـــەولوودی پـــێغەمبەرن بـــبەخشە
ئـــەگـــەرچـــی زۆر ئـــەمین ســـاحێب خـــەتایە

ئەو جار شەوی ئەوەڵ لە مانگی مەولوود. حاسڵ بوو لە بۆ ئامینەی، فەرەح و سروور.

شەوی دووهەم، موژدەی درایە بە حاسڵ بـوونی مـەقسوودی نـێزیک و دوور.

شەوی سێهەم لە غەیبەوە بیستی نەدا. کە وەختە وجوودی ئەوکەسەی ببێ پەیدا. کە نێعمەت و شوکری ئێمە دەکا.

شەوی چوارەم، دەنگی مەلائیکەتانی بیست ئاشکرا.

شەوی پێنجەم. تیکرار ئیبراهیم خەلیلوڵلا. موژدەی دایە بـە وجـوودی، زجوودی مەسعوودی حەزرەتی رەسوولەڵلا. «د.خ»

شەوی شەشەم، نووری چاوی پێکەوت لە ئەرز و سەما.
شەوی حەوتەم. مەلائیکەتان دەوری حەرەمی ئامینە خاتوونێیان دا.
شەوی هەشتەم، فەرەح و سروور بوو پەیدا.
شەوی نۆهەم، بە ئامینەیان کوت: مبارەک بی لە تۆ نووری حەزرەتی محمدالمصطفی. ئەتۆی مەعدەنی سیدق و سەفا.
شەوی دەهەم، موژدەی درایە بە جێی حەیف و مینا.
شەوی یازدەهەم، سری ئیمانی بۆ ئاشکرا کرا. وەک چرا.
شەوی دوازدەهەم، ئەوێ شەوی، شەوێک بوو رووناک. ئاسمان وەک دڵی سدیقان پاک. نوور دەو شەوێدا بەدەخشان بوو. لە بۆ دڵی من رەخشان بوو. عەبدولموتەلیبی باپیری پێغەمبەر. ئەولاد و ماڵی خوێ لەو وەختەدا، بردبۆ کەعبەی یەکسەر. لە کن ئامینەی نەمابوو هیچ کەس. نە موئەنەس. نە موزەککەر.
ئامینە دەیفەرموو دانیشتبووم تەنها و عاجز دڵم پڕ بوو لە غەمان. کوتم هاوارە لە خۆمی ماڵوێران. کەس نیە قومێک ئاوێم بداتێ. خنکام لە تێنان. کەس نیە پشتیوانم بێ. وەکوو مامان. کەس نیە پاڵی وێبدەم. کەس نیە قسەی دەگەڵ بکەم. کەس نیە ئەنیسم بێ. کەس نیە جەلیسم بێ. کەس نیە مامانم بێ. کەس نیە پشتیوانم بێ.
ئامینە دەفەرمووی: لە نەکاو را دیتم شەق بوو چوارگۆشەی دیوار. هاتنە ژووری چوار ژنی بالاّ بڵیندی ئاهوو رەفتار. هاتنە لام. ئەوەڵیان دەستی کرد بە گوفتار.

ئەی ئومەتی محەممەدی بڵێن بە زەوق و بە سەفا
صَلّوْ عَلیٰ مُحَمَّد سیدی عالم مصطفی
ئەو چوار ژنی دە نازەنین جەماڵ ماهی منەوەرە
سەلامیان کرد گەلێک شیرین لە ئامینەی موعتەبەرە

ژنــی ئــەوەڵی حــەوا بــوو، جــەماڵی هــەروەک چــرا بــوو
ئــەو دەپــێشی هــەمووان داپــوو، چــونکە ئــەو ام‌البشــرە
فــەرمووی مــزگێنی بــێ لە تــۆ یــا ئــامینەی مــونەوەرە
زاهــیر دەبــێ زاتــێک لە تــوو حــەبیبی حــەیی ئــەکــبەرە
ئەو جــار ســارا دەهــاتە ژوور، شــۆعلەی دەدا لە رووی نــووری
فــەرمووی مــزگێنیٚ بــێ لە دوور یــا ئــامینەی بــەختەوەرە
ئــەولادێکی دایــەی خــودا، نــاوی مــحەممەد مســتەفا
شــاهی جــەمیعی ئــەنبیا، شــەفیعی رۆژی مــەحشەرە
ئــاسیە بــوو ژنــی ســێمین، ســەلامی کــرد گــەلێک شــیرین
یــا ئــامینە لێت مــزگێن، کــوڕی تــۆ ســەیدی ســەروەرە
جــا هــاتە ژووری مــەریەمە چــەند مــەتحی بــڵێم کــەمە
مــاموٚچەی فــەخری عــالەمە، دایکــی عــیسا پــێغەمبەرە
فــەرمووی بــە لەفــزێکی شــیرین، یــا ئــامینە لێت بــێ مــزگێن
کــوڕت مــحەممەدی ئــەمین بــۆ ئــەنبیا یــان ســەروەرە

ئامینە دەر فەرمووی ئولفەتم گرت بە وان. دەستیان کرد بە قسان. دیتم مەخلووقات روویان کردە حوجرەی من جەماعەت بە جەماعەت. ئەسوات و موشتەبیهات. لوغات و موختەلیفات. لە نێو حوجرەی من دەهات. بلێسەی نوورین پەیدا بوو لە هەموو ولات. لە پێش و پاش و چەپ و راست. عەجایبات بوون زهوور. عالەم پڕ بوو لە نوور. زەمین بوو بە فەلەک. رووی ئەرزی پڕ بوون لە مەلەک. ئاسمان سەیری زەمینی دەکرد. حەسرەتی بە زەمینێ دەبرد.

شەیتان دەگەڵ دێوان. هەلاتنە سەرکێوان. پڕ بوو لە مەلەک سەری ئەرزی. خالّی نەما بە قەد جێی سەری دەرزی. بوت سەربەرە ژێر بوون. بوت پەرەست کوێر بوون. غەرق بوو ئاوی ساوە. ئاگری فارسی کوژاوە. ئەیوانی کەسرایێ شەق

بوو. جیێ بە کافران لەق بوو. پادشا هەموو بەد حاڵ بوون. هەموو زمانیان لاڵ بوو. شاهی عەجەم خوسرەو. رۆژی رووناکی لیێ بوو بە شەو. خاقان حاکمی چینیێ بوو بە پەندی سەر زەمینیێ. بە تەع حاکمی یەمەنیێ. دەستی کرد بە شیوەنیێ. لات مات بوو. نەسری نوسرەت چوو. (عوزا) لە مەرتەبەی خۆی داخزا. لە کافران بوو بە قەزا. هوبڵ، رووی رەش بوو وەک قەل. یەغووس، بوو بە سەگی ناو مەجووس.

ئیلاهی بە جاهی نبی‌المعظم
وبیت‌المعظم، و بل نوراعظم
بە حەقی محەممەد شەهی ئەنبیایان
بە مەولوودی شاهی نەبیی مووکەڕەم
بە لوتفی عەمیمت ببەخشە گوناهم
بە زاتی کەریمت، بە فەخری دوو عالەم
فەقیرم، گەدامە، لە دەرگاهی پاکت
بە حاڵی هەموو کەس، تۆ دانایی و ئەعلەم
بکە روحمێکی یا ئیلاهی بە حاڵم
لە رۆژی قیامەت، لە ناری جەهەننەم
ئیلاهی بە حەقی کەلامی مەجیدت
بە سەدیق و سادق، بە فارووقی ئەعزەم
بە زینووری عوسمان، بە شاهی ویلایەت
عەلیی وەلی، حەیدەری شێری ئەکرەم
ببەخشا «ئەمین» ی گونەهکار و عاسی
بە خوێنی شەهیدانی ماهی موحەڕەم

بەعدەزئان خوداوەندی عەزیمووشەئن. ئەمری کردە تاوسی مەلایکەتان.

یەعنی جوبرێلی ئەمین و ئەمان. پڕ بکا پیاڵەی بلوور. لە شەرابەنتەهوور. رابیەخە سەججادەی قوربی ویسال. بۆ ساحێبی نووری رفحتالاتصال. بە ریزوانی بڵێ باغ و باغات و قەسر و قسوور و غیلمان و حۆری لە بەهەشتێ موزەییەن بکا. بە مالکی بڵێ دەرکەی جەهەنەمێ کلیل بدا. دابنێ ئالای موحیبەتی لە سەر شان. بانک رابهێڵە لە ئەرز و ئاسمان. لە کێوان و لە دەشتان. لە بەریان و لە بەحران. کەنیزێکە عاشق جەماڵی مەعشووقەی ببینێ. مووحیب میوەی ویسالی باغی مەحبووبێ بچێنێ.

دەر حاڵ حەزرەتی جوبرەئیل. بە جێی هێنا فەرمانێ. حەزرەتی رەبی جەلیل. عەرش و کورسی و سەماء. کەوتنە هەڵپەڕین و سەما. مەلایکەتان دەوری حەرەمی ئامینە خاتوونییان دا. تەیر و وحووش و دەرەندە و هەموو ئەشیا. دەستیان کرد بە شادی و نەغمە و تەرەنەم و ئاواز و سەدا. سێ ئالا هەڵدران. یەک مەشریق و یەک لە مەغریب. یەک لە سەربانی کعبةالله. هەر ئالایەکی لەوان. سەد هەزار مەلایکەی لە بن راوەستان.

ئەی ساحێبی ئوممەتێ، شەفیعی لە قیامەتێ
دەستی مەو دامانی تۆ، لە بۆن کەی شەفاعەتێ
ئەی شاهی عالیجەناب، ساحێبی وەحی و کیتاب
لە رۆژی حەشر وحیساب، لە بۆن کەی شەفاعەتێ
ئەی شاهی ئاخیر زەمان، ساحێبی وەحی و قورئان
لە رۆژی حەشر و میزان، لە بۆن کەی شەفاعەتێ
حەبیبی حەیی ئەحەد، لە تۆ دەخوازین مەدەد
گونەهکارین بێ عەدەد، لە بۆن کەی شەفاعەتێ
ئەی شاهی جەهەتمونیر، هەرتۆی بەشیر و نەزیر
لە دەرگای حەیی قەدیر، لە بۆن کەی شەفاعەتێ

ئـــەی شـــاهی دونـــیا و دیـــن، حـــەبیبی حـــەیی مـــوعین
تـــۆی شـــفیع‌المـــذنبین، لە بـــۆن کـــەی شـــەفاعەتێ

ئامینە دەفەرمووی تینوو بووم لەو وەختی دا. دیتم لە غەیبەوە پیاڵەیەکی پڕ لە شەربەتیان لە بۆ من هێنا. کە خواردمەوە نوورێکی عەزیم لە پێش چاوم بوو پەیدا. کە حەزرەتی جوبرەئیل بوو، هاتە حوجرەی من بە قەدەمی سیدق و سەفا. شاپەڕی مبارەکی بە سەر من دا هێنا. بێ زەحمەت و موشەققەت وەزعی حەملم بە ئاسانی رونا. (ولدالنبی)

والسلام علیکم و رحمةالله و برکاة

١ - حەزرەتی سەید تەها، ناسراو بە (پیری شەمزینی)، ساڵی کۆچی دوایی کردووە، گۆڕی پیرۆزی لە نەهری یە.

٢ - شێخ عەبەیدوڵڵا غازی، ساڵی ١٢٨٧ی کۆچی مانگی، ١٢٤٦ی هەتاوی لە دەس زوڵم و زۆری عوسمانی یەکان رای کرد. ساڵی ١٢٩٨ی کۆچی مانگی ١٢٥٧ی هەتاوی بۆ ئیستانبوول دوورخرایەوە. ساڵی ١٢٩٩ی کۆچی مانگی - ١٢٥٨ی هەتاوی گەڕایەوە شەمزین. ساڵی ١٣٠٠ی کۆچی مانگی - ١٢٥٩ی هەتاوی بۆ جارێکی تر. دوور خرایە بەیرووت. هەر لەو ساڵەدا چۆوە مەککە و هەتا کاتی مەرگ «١٣٠٠-١٢٥٩» هەرلەوێ ماوە و لە «تایف»ی مەککە وەفاتی کرد و هەر لەوێش نێژرا.



٣ - حــەزرەتی سـەید عـەبدولقادر، ناسراو بە «غەوسی سانی». لە رۆژی ١٦ی نیسانی ١٩٢٥ی زایینی - ١٣٠٤ی هەتاوی «٢٣ی رەمەزانـی ١٣٤٢» هـاوڕێ دەگـەڵ کـوڕەکـەی سـەید مـحەممەد نـەوجەوان (کــوڕانــی شـێخ عـوبەیدوڵڵا) لە لایـەن حکوومەتی مستەفا کەماڵەوە دەس بە سەر کـران و هــەر لەو ســاڵەدا شـەهید بـوون و مەرقەدی هەر دوویان لە شاری دیاربەکرە.



٤ - سلطان‌العرفا، حەزرەتی حـاجی سەید عــەبدوڵڵا گــەیلانی‌زادە (ئــەفەندی) کوڕی حەزرەتی سەید عەبدولقادر، سیٚ ی پــووشپەڕی ١٣٤٣ی هــەتاوی لە ورمـێ وەفاتی کرد و مەرقەدی مبارەکی لە دزێـی مەرگەوەڕە.



٥ - حەزرەتی سەید عەبدولقادر گەیلانی‌زادە، کوڕی سەید عەبدوڵڵا، دوای کۆچی باوکی بوو بە جێ‌نشین. حەوتی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٦ی هەتاوی کۆچی دوایی کرد و لە دزێی مەرگەوەڕ لە قەراخ باوکی نێژرا.



٦ - حەزرەتی سەید فارووق گەیلانی زادە، کوڕی حەزرەتی سەید عەبدولقادر، ساڵی ١٣٢٩ لە دایک بووە. ئێستا جێ‌نشینی باوکیەتی و لە دزێی مەرگەوەڕ دەژی.

١ - حەزرەتی شێخ سەید کەماڵەدینی حوسێنی ناسراو بە «هادییەدین» کوری سەید شامە. خەلیفە و جێنشینی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزین بوو. ساڵی ١٣٣٩ی کۆچی مانگی لە زینوێی عێراق وەفاتی کردووە و مەرقەدی پیرۆزی هەر لە دێی زینوێیە.

٢ - حەزرەتی شێخ سەید عەبدوڵڵا ناسراو بە «شێخ جەلالەدین» کوری حەزرەتی شێخ کەماڵ. ساڵی ١٣٣٤ی کۆچی مانگی لە زینوێی عێراق وەفاتی کردووە.



٣ - حەزرەتی شێخ عەلاوەدین ناسراو بە «موحیەدین» کوڕی حەزرەتی شێخ جەلال ١٧ی خەرمانانی ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی لە بەغدا وەفاتی کردووە و لە گۆڕستانی ئەعزەمی‌یە و لە تەنیشت ئیمام ئەبووحەنیفە، نزیک مەرقەدی مبارەکی ئیمام مووسای کازم نێژراوە.



٤ - حەزرەتی شێخ سەید تەها کەماڵی زادەی نەقشبەندی کوڕی حەزرەتی شێخ عەلاوەدێن. ساڵی ١٣٠٢ ی هەتاوی لە دێی خەلان لە دایک بووە. ئێستا قوتبی ئەو بنەماڵەیە و مزگەوت و خانەقاکەی لە شاری ورمێ جێگەی رێبەروانی ریگەی تەریقەتی نەقشبەندی یە.

١ - حــەزرەتی حــاجی شــێخ عــەبدولعەزیز بــەرزەنجی، نــاسراو بــە ســەدرەدین، گــەورەی حــەوت تــایفەی بەرزەنجیان بووە، لە گوندی ئەحمەدلەوەند وکانی کەوەی ناوچەی چەمچەماڵی عێراق ژیاوە و هەر لەوێش لە ساڵی ١٣٤٣ک. م کۆچی دوایی کردووە.



٢ - حــەزرەتی حــاجی شــێخ ئیسماعیلی بەرزەنجی سەرۆکی تەریقەتی قادری یەی ئێران لە زستانی ساڵی ١٣٣١ی. هکۆچی دوایی کردووە وگلکۆی پیرۆزی لە شاری شنۆیە .

٣ - حەزرەتی حاجی شێخ مەعرووفی بەرزەنجی کوڕی حەزرەتی شێخ ئیسماعیل لە ســاڵی ١٢٩٥ای هـلە دایک بــووە و لە بەهاری ١٣٤٩شدا کۆچی دوایی کردووە و لە شاری شنۆیە نێژراوە.






١ - حەزرەتی شێخ بابا ناسراو بە «صدرالسادات» ناسراو بە «ابوالسعید» کە لە زستانی ساڵی ١٦ - ١٩١٥ی هـ، بە پێی نووسراوەی واسلی نیکیتین بە دەستی تورکەکانی عوسمانی لە دار دراوە و گڵکۆی پیرۆزی لە گوندی غەوس ئابادی مەهابادی‌یە. حەزرەتی شێخ شاعیر و نووسەرێکی گەورە بووە کە زۆر بەرهەمی گەورەی لێ بە جێماوە کە یەکێک لەو بەرهەمانە مەسنەوی مەعنەوی سەعدییە یە. بە داخەوە تا ئێستا هیچ کام لە بەرهەمەکانی جەنابی شێخ چاپ نەبوونە.




٢ - حەزرەتی شێخ نەجمەدین بەرزەنجی ناسراو بە «امین السادات» برازای حەزرەتی شێخ بابا کە پاش ئەو زاتە بوو بە جێگری ئەو و لە ساڵی ١٣١٨ی هەتاویدا کۆچی دوایی کرد و لە غەوس ئابادی بە خاک سپێردرا.




٣ - حەزرەتی شێخ حەسەن بەرزەنجی کوڕی حەزرەتی شێخ نەجمەدین کەلە ساڵی ١٣٥٠ای هەتاویدا کۆچی دوایی کرد و گڵکۆی پیرۆزی لە گوندی غەوس ئابادی‌یە.




٤ - حەزرەتی شێخ نەجمەدین کە پاش باوکی بوو بە جێگری ئەو و شێخ نەجمەدین لە ساڵی ١٣١٩ای هـ لە دایک بووە و ئێستا بەرپرسی ڕێنوێنی و ئیرشادی موریدانی ئەم بنەماڵەیە و لە شاری مەهاباد و خانەقاکەی جێگای ڕێڕەوانی ڕێگای تەریقەتی قادری‌یەیە.

الهی بی پناهان را پناهی — بسوی بی پناهان کن نگاهی
رحیمی،چاره‌سازی، بی نیازی — کریمی، دلنوازی ، دادخواهی
الهی تکیه بر لطف تو کردم — که جز لطفت ندارم تکیه‌گاهی
مقام عز و جاهت چون ستایم — که برتر از مقام و عز وجاهی
خوشا آنکس که بندد با تو پیوند — خوشا آن دل که دارد با تو راهی
مرا شرح پریشانی، چه حاجت — که بر حال پریشانم گواهی
نهاده سر به خاک آستانت — گدایی دردمندی عذرخواهی
مران از آستانت این گدارا — پناه آورده سویت بی پناهی
گرفتم دامن بخشنده‌ای را — که بخشد از کرم کوهی به کاهی
تهی دستی که با اشک ندامت — ز پا افتاده از بار گناهی
چه کم گردد ز خالق گر نوازد — ز رحمت بنده‌ای را گاهگاهی
به آب چشمهٔ لطفت بشویی — اگر سر زد خطایی اشتباهی
امید لطف و بخشش از تو دارد — اسیری، شرمساری، روسیاهی
ز نخل رحمت بی انتهایت — بیفکن سایه بر روی گیاهی
مران یا رب ز درگاهت «امین»را — که دیگر در بساطم نیست آهی

# در مدح حضرت رسول اکرم (ص)

ای ثنا خوان جلالت حضرت روح‌الامین
پرتو شمس جمالت نور افلاک و زمین
خادمان آستانت خضر و الیاس و شعیب
پایه اوج کمالت عرش رب العالمین
افتخار انبیایان تاج فرق اولیا
سرور هر دو جهان و سید دنیا و دین
کرده حق وصف ترا در هر دو عالم آشکار
آمده در شأن پاکت رحمةاللعالمین
آرزوی بوس پایت میکند قصر جنان
انتظار وصل رویت میکشد هر حور عین
ای پناه عاصیان فریادرس روز عذاب
امت خود را رها کن یا شفیع‌المذنبین
عاصی و درمانده و زار و ذلیل و مذنبم
بی پناه افتاده‌ام جز تو ندارم کس معین
از خدا رحم و ز پیغمبر شفاعت روز حشر
نیست شک و شبهه‌ای اندر نجاتت ای امین

تـا گـل رخسـار تـو گـردید از چشـمم فـغان
شد بـهار عـاشقان پـژمرده چـون رنگ خـزان
تـا جـمال آفـتابت کـرد از دنـیا غـروب
گشت روز روشـنم تـاریک شب انـدر جـهان
نرگس شـهلای تـو خـوابـید در خـاک زمـین
قامت رعنای تـو پـنهان شـد از ایـن بـوستان
شمع رخسار تو کـو پـروانـه آسـا هـر طـرف
تا بـه دور روی تـو یکسـر فـدا سـازیم جـان
سـرو گـلزار امـین قـمری صـفت در گـردنم
هست طوق عشق تو از هر طرف کـوکو زنـان

# در بیان معجزات حضرت سراج‌الدین

ز قطب هورمان گویم حدیثی بس خوش و زیبا
سراج الدین لقب عثمان ضیاء چشم نابینا
یکی روزی بصحرا رفته بود آن پیر نورانی
مریدان چند نفر بودند اندر خدمتش برپا
بناگاه اشتری دیدند کز صحرای دور آمد
به نزد حضرت شیخ و شکایت کرد از مولا
بخاک افتاد رویش بر زمین مالید از پیشش
ندانست از مریدان هیچکس این سرّ ناپیدا
یکی دامان شیخ خود گرفت و گفت کای مرشد
چه میخواهد شتر از تو که زین سان آمده اینجا
جوابش داد کاین اشتر زدست ساربان خود
شکایت میکند گوید گریزانم در این صحرا
کند بار گران و ناتوان و خسته‌ام لاغر
زند هر دم به مغز من هزاران چوپ بی پروا
طلب فرمود زان پس ساربان را شیخ سراج‌الدین
بدو یک توبه داد و اشتر آسوده شد و تنها
امین از بار عصیان ناتوان و خسته شد لاغر
بدرگاه تو آوردم شکایت ای گل یکتا
ندارم طاقت بارگران این همه عصیان
به لطف خود علاجی کن که من افتاده‌ام از پا

# در سوگ مرگ حضرت عبدالعزیز صدرالدین

آن صــــدر ولیـــعهد کــزین دار فــنا رفت

افســوس در ایـن وقت کـه او از بـر مـا رفت

گــویند اگــر شــیخ بـدین زودی چـرا رفت

مــــنزل بــجنان بــرد ســوی دار بــقا رفت

او مـــرد خــدا بــود کـــه در راه خـــدا رفت

اولاد نــــبی بــــود مـــروج بــه شــریعت

هـــم نســل عــلی بــود ولیــعهد طــریقت

غــــواص دُرّبــــحر مــــعانی حـــقیقت

از بـــوی رخش گـــلشن دل یـــافته زیـــنت

در بـــاغ جــهان بـرگ گــل از بـاد صـبا رفت

امــروز کـنم از غـم دل بـر سـر خـود خـاک

حــقا کــه گـریبان بـدرم تـا بـه مـیان چـاک

رفت ازسر و دل صبر و سکون، طاقت و ادراک

بــا ســوز جگـرجـوش درون دیـدۀ نـمناک

نــالیم عــزیزان کــه عــزیزم بــه کـجا رفت

دارنــــد بــدل درد فــراقش هــمه درویش
عــالم هـمه از حسـرت رویش شـده دلریش
چــون لاله اگــر فـاش کـنم داغ دل خـویش
آتش بــزنم بــر جگــر خــلق کــم و بــیش
دود جگــر مــاست کـه بـر اوج سـما رفت

آن گـــوهر یکـــدانـۀ دریــای ســعادت
آن لؤلؤ رخشــــانۀ لالای ســـــیادت
پـــوشید رخ خـــود زنـــظر تــا بــقیامت
گــردید نــصیب تــو امــین درد و نــدامت
دیگر چه بگـویم کـه زغـم بـر تـو چـها رفت

# تخمیس امین بر غزل سعدی شیرازی

دوش وقت سحرم دیده چو از خواب گشود
شاهد حسن سخن در نظرم جلوه نمود
یادم آمد سخنی بشنوی گر بینی تو سود
شرف مرد بجوداست و کرامت بسجود
هر که این دو ندارد عدمش به ز وجود

پند من از ره نیکی تو یکایک بشنو
جاده راست چون خواهی بدگر راه مرو
تخم نیکی بفشان بهره خوری وقت درو
ایکه در نعمت و نازی بجهان غرّه مشو
که محال است در این مرحله امکان خلود

چند از غصه جگر خون کنی از بهر زوال
بهر این دولت بیهوده دنیا ز خیال
غیر کفنی نبرد شاه و گدا و صاحب مال
ایکه در شدت و فقری ز پریشانی حال
صبر کن کاین دو سه روزه بسر آید موعود

آنکـــه دارد بـــجهان مـــال بســی زیــنت و زر
از تـــو مـــحتاج‌تر و از تـــو بســی هست بــتر
حــاجت از بــنده مــخواه همچو تـو افتاده بـدر
دست حــاجت چــو بـری پیش خـداونـدی بـر
که کریم است و رحـیم است و غـفور است و ودود

عــارفان آنــچه کـه فـانی است بـه هـیچش نـخرند
بــهر احــوال جــهان چــون گــذرد غـم نـخورند
آنـــچه انـــدر پــی لاشــه است هــمه جــانورند
دیـــنی آنــقدر نــدارنــد کــه بــرو رشک بــرند
ای بــرادر کــه نــه مــحسود بــماند نــه حســود

راز ایــن نکــته زکس نــیست نــهان گــویم فــاش
آدرس اســـم و مســـماش مــطابق بُــدی کــاش
روزهــا رفت دگــر گــرنه تـو کـوری چـو خـفاش
خــاک راهــی کــه بــرو مــیگذری ســاکـن بـاش
که عیون است و جفون است و حدود است و قدود

ایــن فــریبنده جــهان جــادوی مکــرآمــوز است
هــر کســی خــورد فــریبش چـو مـن دلسـوز است
عمر صد سـال چـنان دانـی کـه ایـن یک روز است
ایــن هــمان چشــمه خــورشید جـهان افـروز است
کـــه هـــمی تـافـت بــر آرامگــه عــاد و ثــمود

فـــلکم گـــوشه دل خـــانه مـــحنت کـــرده است
هـــر کسـی را بـطرب جسـم خـودش پـرورده است
جـــان بـــیمار امـــین در غـــم خـــود پـرورده است
پـــند سـعدی کـه کـلید در گـنج سـعد است
نـــــتوانـــد کـــه بـــجا آورد الاّ مســـعود

# تخمیس امین بر غزل مولانا خالد (قدس سره)

رفت از دستم جوانی آه و فریاد ای دریغ
گشت بی طاقت تنم از کار افتاد ای دریغ
با هزاران آه و حسرت میکشم داد ای دریغ
عمر گشت درکار ناهموار بر باد ای دریغ
هیچ روزی روز فردا ناورم یاد ای دریغ

گرچه دانم نیست جای شادی این دار المحن
زیر خاک تیره باید ساخت تا محشر وطن
غافلم بس از حساب و کردەهای خویشتن
مینهم هر دم بنای بر هوابیچاره من
قصر اعمالم بود بس سست بنیاد ای دریغ

بس که هستم در جهان محزون و غمناک از گناه
کرده بر آمرزش حق تکیه بی باک از گناه
دارم امیدی برحم حق شوم پاک از گناه
بر زمین افتادەام روبر سر خاک از گناه
هیچ از قهاری او ناوردم یاد ای دریغ

چـــند بـــودم در پـی فــرمان نــفس خــو دوان
هــیچ انــدیشه نکــردم یکــدم از ســود و زیــان
طـــالب دنـــیای فـــانی آشکـــار و در نـــهان
آرزوی دولت نـــــاپایدار ایـــــن جـــهان
چـــند دولتـــهای جـــاویدم ز کـــف داد ای دریـــغ

نــفس و شــیطان هــوا و ایــن جــهان پــر فسـون
دشــمنی کــردند بــا مــن تــا کــه کـردندم زبـون
کــی تــوان کــردن از ایــن دام بـلا خـود را بـرون
راه تــاریک است و هـم بـاریک و هـمره دیـو و دون
مــانده زیــر بــار عــصیان زار و نــاشاد ای دریغ

تــا کــه هســتی در جـهان در کـار دیـن خـود فـزا
ای بــرادر آنــچنان کــن حــق شــود از تــو رضــا
تـــوبه کـــن بــاری امــین از کــردەهای نــاسزا
نـــیکی نـــاکـــرده ثـــبت نـــامه در روز جـــزا
خـــالد آلوده چـــون خـــواهـــد شـــد آزاد ای دریـــغ

# تخمیس امین اشنویی با شیخ رضا کرکوکی

این اشک یا دریا بود کز دیده ما میرود
سیلاب خونم دمبدم از فرق تا پا میرود
در جنگ دشت کربلا بنگر چه غوغا میرود
در ماتم آل عبا خون همچو دریا میرود
تیغ است بر سر میزنند دست است بالا میرود

گرگان بیدن هر طرف افتاده درجان رمه
از کوفیان بی وفا عالم شده در زمزمه
نور دو چشمان نبی لب تشنه افتاده همه
روی زمین پر همهمه در دست جانبازان قمه
خون در بر و دوش همه از فرق تا پا میرود

بگذار از حسرت کنم این جان خود از تن جدا
لب تشنه مانده هر طرف اولاد شاه انبیا
عباس افتاده چنین یا قاسم نو کدخدا
پیراهن شمع هدا یعنی حسین مجتبی
جانها همه کرده فدا سرها به یغما میرود

خورشید شد بی نـور چـنین پـوشیده مـاتم آسـمان
عــرض و ســما لوح قــلم آمــد مــلایک در فـغان
از دست ایــن ظلم و جـفا بـر آل شـاه انس جـان
من چـون نـنالم ایـن زمـان مـرد ضـعیف و نـاتوان
از بـــرق آه عـــاشقان در ســنگ خــارا مــیرود

چـون دختر خیرالنساء از خــیمه خــود شـد بـرون
جســم بــرادر را بـدید افـتاده زیـن سـان سـرنگون
فــریاد و واویــلا کــنان از دست ظــلم دیــو دون
بــغداد گــردد لالەگــون در روز عــاشورا بــخون
از کـاظمین آن سـیل خـون تـا طـاق کسـریٰ مـیرود

عرش و فلک جـن و مـلک دارنـد دایـم ایـن عـزا
تــا روز مــحشر عــالمی نــفرین کـند شـمر وغـا
یــا رب تــو در دوزخ بـده بـر دشــمنان او جـزا
خــــون ســـیاوش شــد تــباه در مـــاتم آل عـــبا
تـــا دامــن روز جـزا تــا جـنب عـقبیٰ مـیرود

کــردند اهــل کــوفه چــون بـا آل پـیغمبر فسـون
صحرا و دشت کربلا شـد هـمچو دریـا پـر ز خـون
ســادات پــاک هــاشمی هـر سـوی افـتاده نگـون
از طــاق کســریٰ ســرنگون ریــزد بـپای بـیستون
از بـــیستون آیــد بــیرون ســوی بــخارا مــیرود

مـــاه مـــحرم آمـــد و نـــزدیک شـــد وقت عـــزا
کـــرده امـــین اشـــنویی تـخمیس شـعر شـیخ رضـا
یا رب به فضل و لطف خـود بـه نـیکی ده اورا جـزا
مـــن سـنیم نـامم رضـا کـلب عـلی مـرتضیٰ
درویش عـــبدالقـادرم راهـم بـه مـولا مـیرود

# تخمیس امین اشنویی بر غزل خواجه حافظ شیرازی

ای پیر جوان بهر خدا روی بما کن
یک مرحمتی در حق ما بهر خدا کن
هر عشق جهان در دل ما هست جدا کن
ای خسرو خوبان نظری سوی گدا کن
لطفی بمن سوخته بی سرو پا کن

رحمی بگدا گر نکند همچو تو شاهی
در ظلّ کسی نیست ورا هیچ پناهی
کردیم اگر در ره عشق تو گناهی
دارد دل درویش تمنای نگاهی
زان چشم سیه مست بیک غمزه روا کن

صبرم ز دل و خواب زسر برد خیالت
مردم بامید هوس ذوق وصالت
داده است خدا حسن رخ و جاه و جلالت
گر لاف زند ماه که ماند بجمالت
بنمایی رخ خویش و مه انگشت نما کن

عـــاشق شـــده‌ام بـــر بـــتی ابـــروی کـــمانی
آرام دل عـــــالمی مـــــحبوب جـــــهانی
بـــلبل چـــو مـــن از عشـــق رخش داشت فـــغانی
ای ســـرو جـــهان ازچـــمن بـــاغ زمـــانی
بـــخرام دریـــن بـــزم دو صـــد جـــامه قـــبا کـــن

کـــرده است چـــو دیـــوانـــه غـــم عشـــق تـــو مـــارا
بـــهر چـــه نـــمی‌پرسی تـــو احـــوال گـــدا را
تـــا کـــی بـــه امـــین مـــیکنی ایـــن جـــور و جـــفا را
مشـــنو ســـخن دشـــمن بـــدگوی خـــدا را
بـــا حـــافظ مسکـــین خـــود ای دوست وفـــا کـــن

خـــاک بـــر ســـر کـــن دلا در مـــاتم آل عـبا
نـــوحه کـــن انـــدر غـــم شـــاه شـهید کـربلا
چشـــــمها را آب ده از اشک خـــونین دائـــما
از بـــرای نـــور چشـــم مـــصطفی و مـرتضی
بـــا لب خشک و درون پـــر زآتش نـــاله کـــن
بـــــهر آن تشـــنه لبـــان خـــاندان مـــصطفی
آسمان و عرش و کرسی ماه و خورشید و نجوم
بـــا هـــمه کـروّبیان دارنـد چـون تـو این عـزا
دشـــمنان اطـــراف اهـــل بـیت را بگـرفته‌انـد
تـــــو کـــجایی ای امـــیرمؤمنان شـــیر خـــدا
شمر بیدین را ببین از شـهر کـوفه سـوی شـام
بـــا ســـر بـــیمعجر آرد دخـــتر خـــیرالنســاء
هـیچ خـوفی از خـدا شـرمی زپـیغمبر نکـرد
قـــرةالعـــین نـــبی را کـــرد ســـر از تـن جـدا
این تن بیدست عباس است در مـیدان جـنگ
یـــا کـــه جســـم نـــازنین قـــاسم نـــوکدخدا
زیـنب شـوریده حـال انـدر غـم شـاه شـهید
مـــیکند افـــغان و زاری یـــا اخـاه و یـا اخـاه
آه و فریاد سکـینه ایـن جـهان را سـاخت پـر
بـــر گـــلوی اصـــغر آمـــد چـــو آن تـیر قـضا

خاک بر سر کرد ارض و آسمان شد نیلگون

ماه شد رخسار زرد و شمس بی نور از سما

خشک گردی ای فرات از تو نشد سیراب چون

کامهای خشک اولادان شاه انبیا

یارب آنکس را که راه آب از ایشان گرفت

از شراب دوزخش ده آب هر صبح و مشا

مالک دوزخ بیار زنجیرهای آتشین

افکن اندر گردن شمر و یزید بی حیا

دشمنان خاندان حضرت خیرالبشر

مار و عقرب را بر ایشان کن مسلط دایما

نالەهای جانگداز و آه دل سوز امین

سوخته عالم در عزای خامس آل عبا

# دعوت نامۀ امین از قاضی ملا شریف قاضی زاده

قاضی ما حضرت ملا شریف
ای در انظار همه عالم نظیف
ای فراموش کرده یار و دوستان
با گل خود دایماً در بوستان
عشق شعر و رفتن باغت نماند
گشته ناخوش تن ساعت نماند
از برای قاضی ما صد اسف
بار خود کرده گران از هر طرف
خواستم از بهرت بفرستم جواب
کله پاچه دارم امشب ای جناب
شیخ اسماعیل با تو هر دوتان
مر مرا هستید امشب میهمان
کله پاچه صرف کن بی سیر تیز
تا رفیق از تو نباشد در گریز
سیر خوردن بهر من شد سرنوشت
تا که از پیشم گریزد یار زشت
منتظر هستم غروب آفتاب
شیخ را با قاضی عالیجناب
هر کسی در خدمتت آید بیار
تا امین دیگر نباشد انتظار

# در سوگ مرگ قاضی ملاشریف قاضی‌زاده

الوداع ای قاضی ما حضرت ملا شریف
الوداع ای **یار ما** در مذهب شاه حنیف
الوداع ای رایج شرع شریف مصطفی
الوداع ای در کمال علم دانا و حریف
مادر دوران نیارد چون تو عالی گوهری
دیدهٔ عالم نبیند چون تو یک روی ظریف
بیتوأم اندر نظیر اشنود شد زندان غم
بی گل رویت بهار قلب من شد چون خزیف
کرد روی تو اجل از پیش چشم ما نهان
خفت در خاک زمین تا حشر آن جسم لطیف
تا که هستم در جهان ای مونس غمهای من
هر شبی از بهر تو یک فاتحه دارم وظیف
تا قیامت ای برادر گور تو پر نور باد
باش در قصر جنان با حور و غلمان هم ردیف
چشم بگشا و نظر کن دوستانت را ببین
شد امین در اشنوی بیتو ز غم زار و ضعیف

از قول میرزا عنایت نامه‌ای است که امین برای کاکی ایرانی (صافی) نوشته است.

ای صبا بر خـاک ایـران گـر کـنی روزی گـذر
یک سـلامی یـا پیامی سـوی یـار مـن ببر
کاک مرشد را چو دیدی دست و پایش راببوس
از زبـان مـن بگـوی کـای مـرشد والا گـوهر
آرزو دارم بـــبوسم دست و پـــایت را ولی
با همین پیری و ضعیفی کی توان کـردن سـفر
گربه تن دورم ز خدمت دل همیشه پیش توست
یـا حـبیبی یـا مـرادی انت لی نـورالبـصر
هســتم از درد فــراقت دلبـرا هـر روز و شب
سینه سوزان دل فروزان دیده گریان چشـم تـر
ســوختم درنـار هـجران مـن نـمیدانـم چـرا
نـالهٔ جـان سـوز مـن در تـو نـمیگردد اثـر
من که پـروانـه صـفت از بـهر شـمع روی تـو
خوش نمیسوزم بهر شب جان ببازم تـا سـحر
مــردم از درد فــراق دوریت امــا چـه سـود
پـیر و مـعلولم زکـار افـتاده‌ام بـی پـا و سـر
با همین مـوی سـفید و پـیری و ضـعف بـدن
زنده‌ام از یـاد ایـران چـون گـل از بـاد سـحر
خود تو میدانـی عـنایت گشـته مـحتاج درت
بســته از بــهر غــلامی هـر دو کـونیت کـمر
هست محتاج تو چون من هـم امـین اشـنویی
گر کنی از مرحمت گـاهی بـه سـوی مـا نـظر

# نامه امین به خدمت حضرت شیخ حسن برزنجی غوث آباد

السلام ای مرشد ما شیخ حسن
از ندیده عاشق نام تو من (۱)
یادگار خاندان بوالسعید
از وجود تو هزاران مستفید (۲)
شیخ مرحوم آن امین اسلام ما
ریخته لطف خودش درکام ما (۳)
لطف خاصی داشت با من بی گمان
روح پاکش شاد بادا در جنان
تو همی عطر و هم گلاب آن گلی
میوه خوشمزه آن حاصلی
بهر من از غوث‌اعظم کن رجا
درد ما را از کرم سازد دوا
چون بود درویش‌محمد بس عجول
کن همین اشعار کوتاه را قبول (۴)

۱- حضرت شیخ حسن برزنجی غوث آباد

۲- حضرت شیخ بابا ( تخلص بوالسعید )

۳- حضرت شیخ نجم الدین برزنجی ( لقب امین اسلام )

۴- درویش محمد صادق (اهل اشنویه)

تـــو خــــودت مـــولا امـــین را یـــاد کـــن
وز تـــــوجه قـــلب او را شـــاد کـــــن
مـــن امــــین اشـــنوی هـــم چـــاکـــرم
چـــــون سگ درگـــــاه عـــــبدالقـــادرم

# سال قحطی

هزار و سیصد و شصت و دوم سال
ز هجرت رفته شد تاریخ احوال
ز هر سوی جهان آغاز شد جنگ
ز درد و غم دل یک عالمی تنگ
بشد پیدا یکی قحطی ، گرانی
که عالم سیر شد از زندگانی
بگویم قیمت گندم به یکبار
صد و پنجاه تومان گشتم خریدار
نه تنها قیمت گندم گران است
که یک پوت برنج از سی تومان است
یکی از دوستان بفروخت بر من
به ده تومان یکی درهم ز روغن
خریدم مدتی من گوشت ارزان
به سی و دَو قران یک درهم آن
به شصت تومان یکی تبریزی قند
و لیکن هست با او چای فوند
ببین حال زمستان در چه حال است
به ده تومان یکی پوطی زغال است
یکی پوطی ز هیزم یک تومان دان
همه عالم معطّل ماند و حیران

گـــون در ســه تــومان یکـبار دیــدم
بــه صــد مــنت ز هـیزم کش خـریدم
عـجب روز قـیامت بـود بـر خـماست
بــه یک تــومان خـریدم درهـم مـاست
پــــنیرم داد یک درهـــم بـــقالی
بــه ده تــومان نکــردم مــن سـئوالی
کــه ایــن بــاشد یکــی مــرد بـخیلی
پـــنیرش بـــود هــمچون زنــجبیلی
شــدم از یک رفــیق خــویش مـمنون
به هشت تـومان یکـی درهـم ز تـوتون
بـــه مـــن داد وبـــیاوردم هــمان دم
یکــی کــاغذ سیگار یک تـومان هـم
به هفت تومان رسـیده یک مـتر چـیت
رســیده دو قــران یک دانــه کــبریت
خـــروس و مـــرغ را هـــر چـند دیـدم
یکـــی در ســه تــومان روهــم خــریدم
مگو در سـه تـومان مـرغی گـران است
کــه تــخم مــرغ یکـدانـه قـران است
به سی و پنج قـران یک پـونزده (قـند)
ز عـــطاران خـــریدم مــدتی چــند
حــصیر آورد یک شــخصی بـه بـازار
یکـــی در دو تــومان گشــتم خـریدار